# نێتۆرک

# Network



- جۆرو شێوازەکانی نێتۆرک
- جۆرەکانی وایەر (Wire)
- پرۆتۆکۆلەکان (Protocol)



- دانانی IP بۆ کۆمپیوتەر
- پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەر
- Share Printer - Share Folder



- راوتەر وایەرلس چیە؟
- داخستن و بلۆککردنی سایت
- فلتەرکردنی ماک ئەدرەس

ئامادەکردنی

محمد کاظم جاف




- Cisco چییە؟
- دانانی ناوو پاسۆرد بۆ سویچ
- چۆنیەتی Telnet کردن

سێرڤەر، دروستکردنی USER

بەرنامەی NetSupport

# نێتۆرک
# Network

ئامادەکردنی
محمد کاظم جاف



چاپی یەکەم 2016 سلێمانی

ناوەرۆک

## ناوەرۆک

## پێشەکی

ئەم کتێبە دەربارەی نێتۆرکە، بەسودە بۆ ئەو کەسانەی لەبواری ئایتیدا دەخوێنن، بە پێی توانا و ئەو بابەتانەی پێویستن بۆ خوێندکاران باسمانکردووە، چەند بابەتێکمان باسکردووە لەوانەیە هەر بابەتەو کتێبێکی سەربەخۆی بوێت بەڵام لەم کاتەدا و بەپێی مەجال هەر ئەوەندە فریاکەوتوین، هیوادارین سودی لێوەربگرن و بەسەرکەوتویی قۆناغەکانی خوێندن تەواوبکەن و لەپاشەرۆژدا سود بە خۆیان و وڵات بگەیەنن.
ئەگەر پێشنیارێک یان رەخنەیەک هەبو دەربارەی کتێبەکە سوپاستان دەکەین ئاگادارمان بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانین لە چاپەکانی تردا کەموکورِیەکان نەهێڵین.
سوپاس بۆهەرکەسێک کە سودم لێوەرگرتووە لە زانست و زانیاری، بەتایبەت ئەو مامۆستایانەی لە زانکۆ پەیمانگا وانەیان پێوتوم.
کتێبخانەی کوردی کەمترین کتێبی تێدایە دەربارەی ئایتی، هیچ ناوەندێکی تایبەت بە گرنگیدان بەم بوارە نیە، کتێبخانە و خانەی بڵاوکراوەکان خۆیان نادەن لە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە کتێبانە، چونکە دەڵێن تیراژی کەمە هەموکەس نایکرێت تەنها ئەو خوێندکارانە نەبێت کە لە زانکۆو پەیمانگاکانی بەشی ئایتی پێویستیان پێیەتی، ئەمەش ئەوە دەردەخات ئەو کەسانەی ئەم بەشە تەواو دەکەن کە رێژەیەکی زۆرن تەنها لەوکاتەی خوێندکارەو بۆ ئەوەی دەربچێت ئەم کتێبانە دەکرێت، دوای دەرچون هیچ گرنگیەک نادات بە زیادکردنی زانست و زانیاری لەسەر پسپۆریەکەی خۆی، ئێمەش دوای ماندوبونێکی زۆر ئەم کتێبەمان ئامادەکردووە دڵنیاین تەنها خوێندکارانی بەشی زانستی کۆمپیوتەر گرنگی پێدەدەن هەتا ئەوکاتەی خوێندکارن.
ئەگەر خوێندکارانی بەشەکانی ئایتی دوای دەرچون گرنگی نەدەن بەبەشەکەی خۆیان و دوای دەرچون زانستی خۆیان زیاد نەکەن، گۆڤار و کتێبی تایبەت بە ئایتی نەکرِن و نەیخوێننەوە ئەم بوارە هەر بەلاوازی دەمێنێتەوە، هیچ سەنتەرێک گرنگی نادات بە ئایتی و سەنتەرێک یان ناوەندێک ناکرێتەوە بۆ ئەم زانستە هەتا لە کوردستاندا هەنگاوی بەرەو پێشچون بنێت.

ناوی کتێب :نێتۆرک

ئامادەکردنی :محمد کاظم جاف

بابەت :تەکنەلۆژیایی زانیاری و پەیوەندیەکان

تایپ و دیزاینی بەرگ و ناوەوە : محمد

چاپخانە :

چاپی یەکەم —سلێمانی 2015

ناونیشان /عێراق —هەرێمی کوردستان —سلێمانی

Email: m.kazm81@gmail.com

Mobil: 0964 (0) 7701983661

لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە ( )ی ساڵی 2015ی پێدراوە

## سـوپاس

-زۆر سوپاســـی هەمـــوو ئەو کەســـانە دەکەم رۆژێـــک لە رۆژان وانەیەکیان فێرکردوم

-سوپاسی مامۆستاکانم دەکەم لە پەیمانگا و زانـــکۆ

-سوپاســـــی ئەو هـــاوڕێ و خۆشەویســـتانە دەکەم کە هاوکـــارو پاڵپشتمبون بۆ ئەوەی بەردەوام بم

-سوپاسی تایبەتم بۆ ئەو کەسەی وایلێکردم زانکۆم خۆشبوێت

## نێتۆرک چیه؟

سیستمێکه بۆ پێکەوەبەستنی ئامێرەکان، بۆنمونه کۆمپیوتەر، پرنته، سکانەر و کامێرا .

بەکوردی پێی دەڵێن ( تۆڕ )، به عەرەبی پێی دەڵێن ( شبكة ) بە ئینگلیزیش پێی دەڵێن (Network)، بۆ ئاڵوگۆرکردنی زانیاری و داتا لەڕێگەی ناوەندی گوێزەرەوەوە (وایەر ، وایەرلس)

## کۆمپیوتەر

ئامێری کۆمپیوتەر یەکێکه له ئامێره سەرەکیەکان له نێتۆرکدا بەکاردێت، پێش ئەوەی باسی نێتۆرک بکەین بزانین ئامێری کۆمپیوتەر چیه له چی پێکهاتووه

**کۆمپیوتەر بریتیه له ئامێرێک له Hardware وSoftware پێکهاتووه**




## Hardware

هاردوێر بریتیه له پارچه مادییەکانی کۆمپیوتەر وەک :کەیس، ماوس، کیبۆرد، سپیکەر، رام، پرۆسێسەر، هارددیسک ....هتد



## Software

بریتیە لەهەمو ئەو زانیارییانەی لەناو کۆمپیوتەرەکەدا هەیە




**ئەمانیش دوو جۆرە:**

- Application software: بریتیە لەهەمو ئەو بەرنامانەی لەناو کۆمپیوتەرەکەدا هەیە و کاری لەسەر دەکەین (ئۆفیس، فۆتۆشۆپ، میدیا پلەیەر )




- System software : بریتیە لەو سیستمەی کۆمپیوتەرەکە کاردەکات لەسەری (ویندۆز)

## کرداره بنچینه‌ییه‌کانی کۆمپیوته‌ر:

- Input بریتیە لە داخڵکردنی داتا بۆ ناو کۆمپیوتەر
- Processingبریتیە لە چارەسەرکردنی ئەو داتایەی داخڵکراوە
- outputبـریتیە لەهێنـانە دەرەوە و بینینـی داتاکـان دوای چارەسـەرکردن لەرێگەی پرنتەر یان بینیەوەی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە
- Storageبریتە لە خەزنکردنی داتاکە لە هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکە یان فـلاش یان سیدی

(Byte) 8 Bit = 1 Character

(KB ) 1024 Byte = Kilobyte

(MB ) 1024 KB Mega Byte

(GB ) 1024 MB Gaga Byte 1024

(TB )1024 GB Tetra Byte



## Input Device ئامێرەکانی داخڵکردنی داتا:

بریتیە لەو ئامێرانەی بەکارهێنەر داتایان پێداخڵدەکاتە ناو ئامێری کۆمپیوتەرەکەوە:




## Processing Device ئامێرەکانی چارەسەرکردنی داتا:

بریتیە لەو ئامێرانەی دوای داخڵکردنی داتا هەڵدەستێت بە چارەسەرکردنی داتا






Motherboard

Random Access Memory– RAM



Central Processing Unit – CPU



## : ئامێرەکانی بینینەوەی داتا Output Device

بریتیە لەو ئامێرانەی داتاکانت پیشان دەداتەوە دوای چارەسەرکردن

Monitor



Printer



Speakers



## : ئامێرەکانی خەزنکردنی داتا Storage Device

بریتیە لەو ئامێرانەی بۆ خەزنکردن و پاراستنی داتاکان بەکاردێت

Hard Drive



CD/DVD Drive



Zip Drive



Flash memory



Floppy Disk Drive



Jaz Drive






Card memory

## : ئامێرەکانی گواستنەوەی داتا Communications Device

بریتیە لەو ئامێرانەی بۆ گواستنەوەی داتا لە نێوان دوو کۆمپیوتەری پێکەوە بەستراو لە سیستمی نێتۆرکدا بەکاردێت

Network Interface Card – NIC



Modem



# جۆرەکانی کۆمپیوتەر

**1-کۆمپیوتەری تاکەکەسی**

**2-کۆمپیوتەری دامەزراوە**

-**کۆمپیوتەری تاکەکەسی**: ئەو کۆمپیوتەرانەن قەبارەیان بچوکە و بۆ کـاری بچـوک بەکاردێن، واتە بۆ یەک کەس بەکاردێت کاروبارەکانی ئاسایی خۆی پێجێبەجێ دەکات **ئەمانیش چەند جۆرێکن:**



Workstation



Desktop computer



Notebook computer




Tablet computer



Handheld computer




Smart phone

-**کۆمپیوتەری دامەزراوە** :ئەو کۆمپیوتەرانەن بۆ کـاری گەورە بەکـاردێن، نرخیـان گرانە، شێوازی دروستکردنیان تایبەتە بە کاری دامەزراوە گەورەکان، کۆمپانیا و شوێنە گشتیەکان ئەم جۆرە کۆمپیوتەرانە بەکـاردێنن، لەبەر ئەوەی خێرایـان زۆرە و هـاردو رامی زۆریان لەسەرە **ئەمانیش چەند جۆرێکن:**

Servers



Minicomputers




Supercomputers



Mainframes



## سودەکانی نێتۆرک:

- بەشدارییپێکردنی فایل و داتاکان لەنێوان ئەندامانی ناو نێتۆرکەکە
- بەشدارییپێکردنی بەرنامەکان، بەکارهێنانی بەرنامەیەک لە ئامێری سەرەکیدا هەیە
- بەشداریکردن و بڵاوکردنەوەی سەرچاوەکانی وەک پرنتەرو ئینتەرنێت
- پەخشکردنی هێڵی ئیتەرنێت، بەکارهێنـانی ئنتەرنێـت و پەیوەنـدیکردن (ئیمـەیڵ، چات و ڤیدیۆ چات، کڕین و فرۆشتنی ئۆنلاین)
- خەزنکردن و پاراستنی داتاکان لەیەک سەرچاوەدا (بەکارهێنانی سێرڤەر)
- گەڕانەوەی کات

## بەشە سەرەکیەکانی نێتۆرک:

✓ ئامێر :کۆمپیوتەر جۆرێکە لە ئامێر کەنامە دەنێرێ و نامـە وەردەگرێـت، چەنـدین ئامێری تری پاشگر لە نێتۆرکدا بەکاردێت (بۆ نمونە تەلەفون، کامێرا و پرنتەر)

✓ ئامێری نێتۆرک :ئەو ئامێرانەی داتا دەگوازنەوە لەنێوان کۆمپیوتەرەکـان وەکـو لان کارت یان ئەو ئامێرانەی پێوست بۆ پێکەوە بەستنی کۆمپیوتەرەکان وەکو سویچ و هاپ

✓ ناوەندی گوێزەرەوە :کاتێک نامە دەنێریت دەبێت ناوەندێک هەبێت ئەو نامەیـەی پێدا بڕوات ئەویش یان وایەرە یان وایەرلسە

✓ خزمـەتگوزاری -بەرنامەکـان :هـەموو ئـەو بەرنامانـە دەگرێتـەوە لـە نیتۆرکـدا بەکاردیت بۆ جێبەجێکردنی کارێک

✓ پرۆتۆکۆل :کۆمەڵێک یاسامان هەیە کە چۆن نامەکان بڕۆن بەناو نیتۆرکەکەدا ئـەم یاسایانەش پرۆتۆکۆلە

## چۆن جۆرەکانی نێتۆرک دیاری دەکەین:

- بۆشـــایی جوگرافی
- قەبارەی نێتۆرکەکە چەند دائەپۆشیت
- ژمارەی ئەو کەسانەی بەشدارن و پەیوەندیان هەیە
- پەیوەندی نێوان ئامێرەکانی ناو نێتۆرکەکە
- جۆری خزمەتگوزاریی سەر نێتۆرکەکە
- نەخشە و دیزاینی نێتۆرکەکە

## جۆرەکانی نیتۆرک:

- نێتۆرکی ناوخۆیی Local Area Network ( LAN )
- نێتۆرکی دەرەکی Wide Area Network ( WAN )
- نێتۆرکی وایەرلسی Wireless Local Area Network (WLAN)
- ئینتەرنێتۆرک Internetwork

## 1- Local Area Network ( LAN ) نێتۆرکی ناوخۆیی

ئەم جۆرەیان پێی دەڵێن ناوچەیەیی واتە لە ناوچەیەکی بچوک سودی لێوەردەگیرێت، بۆ نمونە ماڵ یان فەرمانگە یان قوتابخانە و شوێنە گشتیەکان سودی لێوەردەگیرێت.




## 2- Wide Area Network ( WAN ) نێتۆرکی دەرەکی

ئەم جۆرە نێتۆرکە بەکاردێت لەشارە گەورەکاندا، بۆ پێکەوەبەستنی شارەگەورەکان یان پێکەوەبەستنی نێتۆرکە جیاوازەکان ، بۆ پێکەوەبەستنی نێتۆرکە بچوک و ناوچەییەکانی وەکو LANیان لەناوچەیەکی وەک زانکۆ سودی لێوەردەگیرێت.



## 3-Wireless Local Area Network (WLAN) نێتۆرکی وایەرلسی

بریتیە لە نێتۆرکێکی وایەرلس، وایەر بەکارنایەت بەڵکو گواستنەوە داتاکان لەڕێگەی هەواییەوە دەبێت، ئەمەش بۆ شوێنێکی بچوک دەبێت، چونکە وایەرلس ناتوانێت بۆ شوێنێکی دور داتا بگوازێتەوە

لەم جۆرەدا ئامێرێکی وەکو ئەکسس پۆینت بەکاردێت بۆ پەخشکردنەوەی وایەرلسەکەو ئامێرەکانی تریش وەریدەگرن لەرێگەی لان کارتی وایەرلسەوە .




## 4-Internetwork ئینتەرنێتۆرک

سەرەتا وەک رێگەیەک دەستپێکرد بۆ پێکەوەبەستنی نێتۆرکە جیاوازەکان، ئەم زاراوەیە بەکاردێت بۆ پێناسەی دوو یان سێ یان کۆمپیوتەر کەپێکەوەبەستران.

کاتێک چەند کۆمپیوتەرێک پێکەوە دەبەستین پێویستمان بە ئامێری ڕاوتەر یان سویچ دەبێت، واتە لە Internetworkدا سویچ و راوتەر بەکاردێت.هەر پەیوەندیەکی گشتی بازرگانی، پیشەسازی و حکومی روبدات پێی دەڵێن Internetwork

**بەپێی ئەو کەسەی بەڕێوەبەری دەبات و ئەو کەسانەی بەشداردەبن Internetworkدەکرێت بە سێ بەشەوە :**

- **Internet**
- **Intranet**
- **Extranet**



## :Internet

بریتیە لە سیستمێکی جیهانی پەیوەندی کۆمپیوتەری بەیەکداچو، پرۆتۆکۆلی TCP/IP بەکاردەهێنێت بۆ پێکەوەبەستنی ملیۆنەها ئامێر لەسەرانسەری جیهاندا، ئینتەرنێت لە نێتۆرکی نێتۆرکەکان پێکهاتووە.

ئینتەرنێت کورتکراوەی International Networking، سەرەتای دروستبونی ئینتەرنێت دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٩ لە ئەمریکا، سەرەتا دوو کۆمپیوتەر پێکەوە بەسترا دواتر دو گەرەک و دواتر شارەکان و دواتر وڵاتەکان پێکەوە بەستران و ناویان نا ئینتەرنێت. ئەمریکا دروستی کرد بۆ زانیاری گواستنەوە لە ناو وەزارەتی بەرگری.

دواتر پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی و بووە زەبەلاحترین نێتۆرک لە جیهاندا، ئینتەرنێت ئێستا زۆر پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە ئێستا هەمومان ئەو نێتۆرکە گەورەیە بەکاردەهێنین.




## :Intranet

بریتیە لە نێتۆرکێکی تایبەت تەنها ستاڤی رێگەپێدراو دەتوانن بچنە ناوەوە، زانیاری و داتا وەربگرن و بینێرن.

بەشێوەیەکی گشتی ئینترانێت خزمەتگوزاریی و زانیاری تایبەتی تێدا دابینکراوە لەلایەن ئایتی سیستمی رێکخراوەکەوە کەلەسەر ئینتەرنێتی گشتی نیە، لەساڵی ١٩٩٤ زیاتر دەرکەوتووە بەدەرچوونی WebServer1996 ی مایکرۆسۆفت زیاتر یارمەتدەر بووە بۆ گەشەی ئینترانێت.



## **Extranet :**

بریتیە لە نێتۆرکێکی سنوردار، خزمەتگوزاری پێویست دابین دەکات بۆ بەشەکانی، کەرتی پیشەسازی لەنەوەدەکان و سەرەتایی ساڵی دووهەزار دەستیانکرد بەبەکارهێنانی ئێکسترانێت بۆ بەناوەندکردن و دوبارە چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی داتاکان، لەگەڵ دابینکردنی ئەپڵیکەیشتنی پێویست.

لە ئیکسترانێتدا تەنها ئەندامانی تایبەتی گروپی ئیش دەتوانن بێنە ناو سیستمەکەوە، بۆنمونە ئەوانەی لەڕوی جوگرافیەوە دورن یان تیمی پرۆژەی کۆمپانیای فرەجۆرن بۆیان هەیە بێنە ناوەوە.




**بەکورتی:**

**Internet** : بریتە لە پەیوەندییەکی نێودەوڵەتی ڕێگە دەدات بە ئەندامانی لەرێگەی وێب سایتەوە بچنە ناوەوە بە خۆرایی بێ ڕێگریکردن

**Intranet** : بریتە لە ناوەرۆکێکی هاوبەش ڕێگەدەدات بە ئەندامانی لەناو ڕێکخراوێکی تاکدا

**Extranet** : بریتیە لە ناوەڕۆکێکی هاوبەش ڕێگەدەدات بە گروپەکان لەڕێگەی ئاڵوگۆڕەوە بەبەزاندنی سنورەکان

## چەند جۆرێکی تری نێتۆرکمان هەیە :

(MAN) کورتکراوەی Metropolitan Area Network

(PAN) کورتکراوەی Personal Area Network

(CAN) کورتکراوەی Campus Area Network

(SAN) کورتکراوەی Storage Area Network

(VPN) کورتکراوەی Virtual Private Network

### -Metropolitan Area networkکورتکراوەی (MAN)

ئەم نیتۆرکە بەکاردێت بۆ بەستنەوەی دوو نێتۆرکی LAN لە قوتابخانە یان زانکۆکاندا، ناتوانرێت بۆ پێکەوەبەستنی شارەکان بەکاربهێنرێت، لەم جۆرەدا راوتەر و وسویچ و هاب بەکاردێت.

### -Personal Area Networkکورتکراوەی (PAN)

ئەم نێتۆرکە کەسیەو تەنها بۆ یەک کەس بەکاردێت، پێکەوەبەستنی کۆمپیوتەرو پرنتەرو سکانەر پێی دەوترێت PAN

### -Campus Area Networkکورتکراوەی (CAN)

ئەم جۆرە نێتۆرکە بۆ کەمپەکان سودی لێوەردەگیرێت، بۆ نمونە بۆ بەیەکەوە بەستنی کۆلیژەکانی زانکۆ ئەم جۆرە بەکاردێت.

## ناوەڕۆکی پەیوەندییەکان:

**پەیوەندییەکان بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردین**

1-ناردنی نامە بۆ هاوڕێیەکت (Email)لەهەر شوێنێکی جیهاندا بێت

2-وەرگرتنی هەواڵ لەڕێگەی وێب سایتەوە

3-چاتکردن و گفتوگۆگردن لەگەڵ خزم و دۆستان لەهەر شوێنێکی جیهاندابن

4-وەرگرتنی فایلێک لە کۆمپیوتەری بەرامبەرەوە دور یان نزیک بێت



## هەیکەلبەندی نێتۆرک ( Network Topology )

هەیکەلبەندی یان نەخشەکانی نێتۆرک، شەش جۆر لە دیزاین و نەخشەمان هەیە بۆ دروستکردنی نێتۆرک، هەر نەخشەو ســودو زیانی خۆی هەیە.

**دەبێت ئەم هۆکارانە لەبەرچاوبگیرێت بۆ دروستکردنی نەخشەیەکی نێتۆرک:**

- پێوانەی پرۆژەکە (چەند ئامێرو کەلوپەلت پێویستە)
- بڕی ترافیک لەسەر نێتۆرکەکە
- بودجەی تەرخانکراو بۆ پرۆژەکە

**جۆرەکانی ( Topology)نەخشە:**

**1-Physical Topology** : بریتە لە پەیوەندی فیزیکی لە نیتۆرکدا بۆنمونە :کێبڵ و کۆمپیوتەرو ئامێرەکان

**2-Logical Topology :** بریتیە لە ڕۆیشتنی داتا لە ئامێرێکەوە بۆ ئامێرەکانی تر ئەمەش بە چەند شێوەیەک داتاکان دەڕوات :

Peer – to – pee : ڕۆیشتنی داتا لە ئامێرێکەوە بۆ ئامێرێکی تر

Multi – Access :لەوانەیە کۆمەڵێک بەکارهێنەر بگەنە ئەو داتایە

Ring ( Token passing ): کاتێک داتا دەنێریت ئەگەر ئامێری مەبەست وەریگرت ئیتر دەوەستێت لەناردنی داتا و ناڕوات بۆ ئەوانی تر

**هەیکەلبەندی ( Network Topology ) نێتۆرک:**

**Physical Topology :**

- ✓ Bus Topology
- ✓ Star Topology
- ✓ Mesh Topology
- ✓ Ring Topology
- ✓ Tree Topology
- ✓ Hybrid Topology

## :Bus Topology

لەسەر هێڵی راست تەنها بە یەک کێبڵ کۆمەڵێک کۆمپیوتەرپێکەوە دەبەسترێن، پێویستمان بە سویچ و هاب و راوتەر نیە




**باشیەکانی** : دروستکردنی ئاسانە، تێچونەکەی کەمە، سویچ، راوتەر و هاب بەکارناهێنین، دەتوانرێت لە نێتۆرکی بچوکدا بەکاربێت

**خراپیەکانی**: کاتێک کێشەیەک لە نێتۆرکەکەدا هەبێت دەبێت هەموو وایەرەکان بپشکنین یان نێتۆرکەکە هەڵبوەشێنینەوە دۆزینەوەی کێشە قورسە

سنوردارە لە کێبڵ و ژمارەی ئامێرەکان، کێشەیەک هەبێت لە کێبڵەکەدا نێتۆرکەکە دەکوژێتەوە، بەرگەی ترافیکی زۆر ناگرێت، سکوریتی لاوازە.

## :Star Topology

بەشێوەی ئەستێرە دەبەسترێت، هاب یان سویچ لەناوەراستدا دانراوە کۆمپیوتەرەکان بەیەکەوە دەبەستێت. کاتێک زانیاری دەنێرین دەچێتە سویچەکەوە ئەوکات دەچێت بۆ کۆمپیوتەرەکان.




**باشیەکانی** :ئەرکەکان باش جێبەجێ دەکات زیادکرنی ئامێری تر ئاسانە، ئامێرێک ئیش نەکاتە کارناکاتە سەر نێتۆرکەکە، بەئاسانی کێشەکان دەدۆزیتەوە

**خراپیەکانی** :ئەگەر سویچەکە خراپ بو نێتۆرکەکە دەکوژێتەوە، بەکارهێنانی سویچ و هاب بودجەی زیاتری پێویستە.

## Mesh Topology



ئەم جۆرە لەو شوێنانە بەکاردێت کە پێویستیان بەدوبارەبونەوەی ئامێری زۆرە، لەم جۆرەدا زۆرجار کۆمپیوتەرێک سێ وایەر یان زیاتری پێوەیە، کاتێک زانیاری دەنێریت بۆ کۆمپیوتەری بەرامبەر نزیکترین رێگا دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی زانیاریەکە بگەیەنێت، بۆیە ئەم جۆرەیان باشترین و خێراترین جۆریانە. ئەگەر وایەرێک تێکچو ئەوا وایەرەکانی تر ئیش دەکەن و زانیاریەکە دەگەیەنێت.

دوو جۆرمان هەیە:

- Full Mesh
- Partial Mesh

**باشیەکانی** :دەتوانین لەیەک کاتدا داتا لە ئامێرێکەوە بگوازینەوە بۆ ئامێرەکانی تر ئەگەر ئامێرێک کوژایەوە ئامێرێکی تر دەبێت بە جێگرەوەی بۆ ئیشکردن بەئاسانی فراوان دەکرێت بێ ئەوەی پچران روبدات لە نیتۆرکەکەدا

**خراپییەکانی**: دوبارەبونەوەی ئامێر لەم جۆرەدا وادەکات نرخی گران بێت پاراستن و دامەزراندنی ئەم جۆرە قورسە، بۆیە دەبێت کەسێکی پسپۆر و شارەزا کاری تێدا بکات و دایبمەزرێنێت

## :Ring Topology




هەمو ئامێرەکان لە لوپێکی داخراودا کاردەکەن و داتاکان بەیەک ئاراستە دەڕۆن

**باشیەکان** :لەم جۆرەدا بەریەکەوتنی داتاکان کەمە، پێویستمان بە سێرڤەر نیە چونکە هەر ئامێرێک بۆخۆی سێرڤەرە

**خراپییەکان** :دەبێت هەمو داتاکان بەئامێرەکاندا بروات بەمەش خاو دەبێتەوە، ئامێریک بکوژێتەوە نێتۆرکەکە دەکوژێتەوە، هەمو نێتۆرکەکە لەسەر یەک کێبڵە ئەمەش خراپە

## Tree Topology




ئەم جۆرە دروست دەکرێت لە جۆرەکانی تر، بۆ نمونە هەندێکجار لە Star و Busدروست دەکرێت

**باشیەکانی**: فراوانکردنی ئاسانە، ئەتوانین دابەشی بکەین بۆ چەند بەشێک، هەڵە بەئاسانی چارەسەر دەکرێت، دامەزراندن و پاراستنی ئاسانە، ئەگەر بەشێکی نیتۆرکەکە خراپ بوو کارناکاتە سەربەشەکانی تر و نێتۆرکەکە ئیشی خۆی بەباشی دەکات.

**خراپیەکانی**: هەموو نێتۆرکەکە لەسەر یەک کێبڵە ئەمەش خراپە ئەگەر بپچرێت نیتۆرکەکە لەکار دەکەوێت، بەشەکان زۆر بوو پەستان زۆر دروست دەبێت ئەمەش پاراستنی قورسە.

## :Hybrid Topology

ئەم جۆرەیان دروست دەکرێت لە جۆرەکانی تر، پێکهاتووە لە دوو جۆر یان زیاتر بۆنمونە لە Busو Star و Ring

**باشیەکان**: دۆزینەوەی کێشەکان ئاسانە، بەئاسانی دەتوانی بەشی تری بۆ زیاد بکەیت، دەتوانیت بەپێی شوێنەکە دیزاینی نیتۆرکەکە بکەیت




**خراپیەکان**: دیزاینکردنی ئەم جۆرە ئاسان نیە
پێویستی بەوردەکارییە بۆ دامەزراندن
پێویستی بە کیبڵی زۆرە
سیستمی ساردکەرەوەی پێویستە

# جــۆرەکانی گواســـتنەوەی زانیــاری

**:one-to-one (unicast)**

گواستنەوەی زانیاری لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ یەک کۆمپیوتەری بەرامبەر.

**:one-to-all (broadcast)**

گواستنەوەی زانیاری لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆهەموو کۆمپیوتەرەکانی تری بەرامبەری.

**:one-to-several (multicast)**

گواستنەوەی زانیاری بۆ ئەو کۆمپیوتەرانەی کە مەبەستە زانیاریان بۆ بنێریت.




# پێداویستیەکان بۆ دروستکردنی نێتۆرک

**کاتێک دەتەوێت نیتۆرکێک دروست بکەین دەبێت ئامادەکاری بۆ بکەین:**

**١-کۆمپیــوتەر:** ئەو کۆمپیــوتەرانەی بەکاردەهێنرێــت لە نێتۆرکــدا دەبێــت، لان کــارتی پێوەبێــت، ڤایرۆســی تێــدا نەبێــت، فــایەرۆڵەکەی لەکاربخرێــت. پێشــتر باســی کۆمپیوتەرمان کردووە

**٢-کێبڵ** بۆ پێکەوەبەستنی کۆمپیوتەرەکان (Cable)

**٣-ئامێرەکانی** ( سویچ –هاب) بۆ پێکەوەبەستنی کۆمپیوتەرەکان



# ناوەنـــدی گوێـزەرەوە
# (Transmission Media)

بریتیە لە ناوەندێک کەدەتوانێت نامە لەکۆمپیوتەرێکەوە بنێرێت و وەریبگرێتەوە

**ڕێگاکـانی گواســتنەوەی زانیــاری و داتــا:**

١- <u>Guided Media (wire)</u>:گواستنەوەی زانیاری لەرێگەی وایەرەوە، دواتر جۆرەکانی وایەر باس دەکەین بەکاردێت لە نێتۆرکدا.

٢- <u>Unguided Media (wireless)</u>:گواستنەوەی زانیاری لەرێگەی وایەرلێسەوە واتە کێبڵ بەکارنایەت و تەنها لەرێگەی هەواییەوە زانیاری و داتا دەگوازرێتەوە.




# جۆرەکانی کێبڵی نێتۆرک

سێ جۆر کێبڵی نێتۆرکمان هەیە، هەر جۆرێک شێوەو نرخ و بەهای خۆی هەیە، باسی هەر سێ جۆرەکە دەکەین:

## ١- Twisted-Pair cables

ئەم جۆرەیان پێی دەڵێن دووانەی مارپێچ




ئەمیش دوو جۆرە:

**شێوەی یەکەم : UnShielded Twisted-Pair (UTP)**

**شێوەی دووەم: UnShielded Twisted-Pair (UTP)**

**شێوەی یەکەم : Shielded Twisted-Pair (STP)**

ئەم جۆرەیان شێلدێک بەدەوری تاڵە وایەرەکانەوە هەیە، ئەمیش پارێزگاری دەکات لەسورە کارەباییەکانی دەرەوە و کار لە خێرایەکەی ناکات.




**شێوەی دووەم: UnShielded Twisted-Pair (UTP)**

ئەم جۆرەیان کۆتاییەکەی بەRJ45کۆتایی هاتووە، ئەم جۆرەیان شێڵدی نیە، هەشت وایەری تێدایە

- ئەم جۆرەیان بەکاردێت بۆ تەلەفونات و نیتۆرکی بچوک (LAN)
- ئەم جۆرە کێبڵە باندوزی کەمە بۆیە بۆ دەرەوەی ناوەوەی بینا بەکاردێت
- نرخی هەرزانە هەروەها دروستکردنی ئاسانە



## ٢- Coaxial cables:



ئەم جۆرەیان لە بەستنی سەتەلایت و تەلەفزیۆندا بەکاردێت، ئێستا زۆرکەم بەکاردێت، توانای کارکردنی کەمە، بە کەڤەرێکی پلاستیک داپۆشراوە تاڵێکی مس لەناوەراستیدا هەیە.

**دووجۆری هەیە:**

Thick Net - 500 meters

Thin Net - 185 meters

| Category | Impedance | Use |
|---|---|---|
| RG-59 | 75 Ω | Cable TV |
| RG-58 | 50 Ω | Thin Ethernet |
| RG-11 | 50 Ω | Thick Ethernet |

**1- 10BASE2 Thin coaxial:**

لەتوانایدایە ١٠مێگابایت داتا بنێرێت لە چرکەیەکدا، باریکە و بۆ دووری ١٨٥ مەتر بەکاردێت.

**2- 10BASE5 Thick coaxial:** لەتوانایدایە ١٠مێگابایت داتا بنێرێت لە چرکەیەکدا، ئەستورە و بۆ دووری ٥٠٠مەتر بەکاردێت.




کۆتایی وایەری Coaxial بەConnector کۆتایی هاتووە پێی دەڵێن BNCبەکاردێت بۆ بەستن بە لان کارت و سویچ و هاب، وەک لە وێنەکەی خوارەوەدا بەشەکانی دیارە.



## 3-Fiber-Optic Cables:

فایبەری تیشکی (لیزەر)، باشترین جۆری وایەرە توانایەکی زۆرباشی هەیە لە گواستنەوەی زانیاری و داتاکاندا، سورە کارەباییەکانی دەرەوە کاریان تێ ناکات و خێرایی کەمناکاتەوە، ناوەوەی شوشەیە و نابێت زۆر بچەمێنرێتەوە، توانای گواستنەوەی زانیاری زۆرباشە بۆ دورترین میل.

لەنێوان وڵاتاندا بۆ گواستنەوەی ئینتەرنێت بەکاردەهێنرێت، لەناوچە سادەکاندا بەکاردێت.




گواستنەوەی زانیاری و داتا لە فایبەردا بەشێوەی رووناکی (تیشک)یە، بەشێوەیەک دروستکراوە زانیاری و داتا بەفیرۆ نەچێت.




**Core**: مادەیەکی شوشەییە لە سلیکۆن دروستکراوە، داتاکان بە شێوەی تیشک بەناو Cord ا دەڕوات.

**Cladding**: ئەم بەشە چواردەوری Coreی داوە بۆ گەڕانەوەی تیشکەکان، دواتر چەند بەرگێک دەوری Cladding و ئەوانی تری داوە.

ئەمەش وادەکات تا ئێستا فایبەر باشترین کێبڵ بێت و جێگرەوەی نیە بۆ گواستنەوەی داتاو زانیاری، لەم وایەرەدا داتاو زانیاریەکان بە فیرۆ ناچێت.

## جۆرەکانی کێبڵی فایبەر:




**Single Mode-1**

- ئەم جۆرە ناوەڕۆکەکەی ( Core)بچوکە
- ڕۆیشتنی داتاو زانیاری بەشێوەی تیشکە
- کەمتر سیگناڵ ون دەکات
- بۆ دوری 100 کیلۆمەتر بەکاردێت

**Multi mode-2**

- ناوەڕۆکەکەی (Core)گەورە و فراوانە (لە Single Modeگەورەترە)
- داتاو زانیاریەکان بەشێوەی light emitting diode -LEDپێدا دەڕوات
- بۆ دوری 2 کیلۆمەتر بەکاردێت

**شێوازی گواستنەوەی داتاو زانیاری لە جۆرەکانی فایبەردا**

ئەگەر سەرنج بدەیت لە Multiیدا ناوەڕۆکەکەی (Core) گەورەو فراوانە



a. Multimode, step index



b. Multimode, graded index

سەرنجیش بدە لە Single دەبینیت ناوەڕۆکەکەی (Core) بچوکە و باریکە



c. Single mode

## شێوازەکانی Connectorلە فایبەردا:

١-(ST) **Straight Tip** : ئەم شێوازەیان لەگەڵ جۆری MultiModeبەکاردێت





٢-(SC) **Subscriber Connector**: ئەم شێوازەیان لەگەڵ جۆری SingleMode بەکاردێت





٣-(LC) **Lucent Connector**: ئەم شێوازە لەگەڵ هەردوو جۆرەکە بەکاردێت





## RJ45چیە؟ شێوازی بەستنی RJ45

RJ45 بریتە لەو پارچە پلاستکیە ڕونەی دەکرێت بەکۆتایی وایەری نیتۆرکەوە، هەشت کونی وردی مسی (pn)ی تێدایە، هەشت تاڵی وردی وایەرەکە دەچێتە ناوی و کەپس دەکرێت، بۆ بەستنی ئەم ئارجەیە چەند کەرەستەیەکمان پێوستە دواتر باسی دەکەین.



بەهۆی ئارجەیەوە ئامێرەکان ( راوتەر – سویچ – هاب )و کۆمپیوتەر پێکەوە دەبەسترێن، ئەو پۆرتەی ئارجەیەکەی تێدەچێت پێی دەڵێن Ethernet

**RJ11: ئەم جۆرە چوار کونی هەیە لەتەلەفوندا بەکاردێت.**




RJ-45 Female




RJ-45 Male

## ئەو ئامێرانەی پێویستن بۆ بەستنی RJ45:




**-Crimping Tools:**

ئەم ئامێرە بۆ کەپسکردنی ئارجەیەکە و
قرتاندنی وایەرەکان بەکاردێت




**-Lan Tester:**

بەکاردێت بۆ تێستکردنی ئەو وایەرانەی
دەیبەستین و دەمانەوێت بەکاریبێنین



**-Joiner:**

بەکاردەهێنرێت بۆ بەستنەوەی وایەرەکان
کاتێک پچراوی تێدایە بەم جۆینەرە پێکەوەی دەبەستین

## بەستنی:RJ45 Connector








دوای ئەوەی پێویستیەکان لەبەردەستا بوون، وایەرەکە بە Crimper کە پاک دەکەین، هەربەو ئامێرەکە شوێنی هەیە بۆ قرتاندن و ڕێکردنەوەی وایەرەکە، سەری وایەرەکە ڕێک دەکەینەوە، پاشان هەر هەشت تاڵە وایەرەکە ڕێک دەکەین و دەیکەین بەناو پنی ئارجەیەکەیا، پاشان دەیخەینە ناو Crimper ئەو شوێنەی بۆ ئارجەیەکە دەشێت، بەدەست پەستان دەخەینە سەری هەتا کرتەیەک دەکات واتە کارەکە سەرکەوتوو بووە

پاشان بە ئامێری تێستەرەکە تێستی ئارجەیەکە دەکەین ئەگەر گڵۆپەکان بێ کێشە ئیشیان کرد واتە بێ کێشەیە دەتوانیت ئەو وایەرە بەکاربهێنیت

پاشان ئەگەر پچراویت هەبوو بە جۆینەرەکە پێکەوەی دەبەستیت.

## دوو جۆر شێوازی بەستنی وایەری نێتۆرک هەیە:

**١- Straight:**

لەم جۆرە بەستنەدا هەموو رەنگەکان بەرامبەر بەیەکە، ئەم جۆرە بەستنی ئاسانە، ئەم جۆرەیان بۆ پێکەوەبەستنی چەند کۆمپیوتەرێک وهابێک بەیەکەوە بەکاردێت.

**واتە بۆ دوو ئامێری جیاواز بەکاردێت**

**ئەم جۆرە بەستە بەکاردێت بۆ پێکەوەبەستنی:**

**-کۆمپیوتەرو سویچ**

**-سویچ و راوتەر**

**-رپیتەرو کۆمپیوتەر**




**٢- Crossover:**

ئەم جۆرەیان بۆ پێکەوەبەستنی دوو ئامێری وەک یەک بەکاردێت، وەکو دوو سویچ و دوو هاب و دوو راوتەر و دوو کۆمپیوتەر، شێوازی بەستنی Crossover جیاوازە.

**لەم جۆرەدا رەنگەکان کەمێک تێکەڵ دەبەسترێن. واتە سەری وایەرەکان بەشێوەی Straightدەبەسترێت و سەرەکەی تریان جیاواز دەبەسترێت وەکو لەو وێنەکەدا دیارە**

**ئەم جۆرە بەکاردێت بۆ:**

**سویچ و سویچ**

**راوتەر و راوتەر**

**کۆمپیوتەرو کۆمپیوتەر**

**رپیتەرو هاب**



## ئامێرەکانی نێتۆرک ( Network Device ) :

ئەم ئامێرانە بەکاردێن بۆ پێکەوەبەستنی کۆمپیوتەر، هەر ئامێرە و جۆرو نرخ و ئیشکردنی جیاوازە، هەندێکیان بۆ نێتۆرکی بچوک بەکاردێت و هەندێکیان بۆ نێتۆرکی گەورە بەکاردێت.

**١- Hub:** ئەم ئامێرە بۆ دابەشکردنی نێتۆرک بەکاردێت، کۆمەڵێک پۆرتی سەربەخۆیی هەیە، وایەرەکان دەبەسترێن لە پۆرتەکان.




**٢- Switch:**

یەکێکە لەئامێرە گرنگەکان بناغەی سویچ لەسەر هاب دروستکراوە، زۆر خێرایە ولە سویچدا کەمتر داتاو زانیاری لەناودەچێت. ئەگەر سویچ بەکاربهێنین لە نێتۆرکدا کاتێک داتاو زانیاری دەنێرین بۆ کۆمپیوتەری ١ ئەوا راستەوخۆ دەچێت بۆ کۆمپیوتەری ١ ئەمەش خێراترە، واتە لە خاڵێکەوە دەروات بۆ خاڵێکی تر ، کەواتە سویچ خێرایی زیاترە لە هاب و لۆدی زۆر لەسەر نێتۆرکەکە دروست ناکات



### ٣- Router:

ئەم ئامێرە زۆر گرنگە بەکاردێت بۆ پێکەوەبەستنی چەند نێتۆرکێکی جیاواز، دەتوانێت نێتۆرکی بچوک ببەستێت بە نێتۆرکێکی گەورەوە. هەروەها بەکاردێت بۆ بەستنەوەی LANو WAN. بۆ پێکەوە بەستنی گەرەک و شارەکان بەکاردێت.




### ٤- Bridge:

ئەم ئامێرە بەکاردێت بۆ پێکەوەبەستنی نێتۆرکە دورەکان (ئەگەر لە شارێکی تر بن)، ئەم ئامێرە چارەسەری زانیاری داتاکان دەکات کە پێی دەگات، چارەسەری بڕانی نێتۆرکیش دەکات.



### ٥- Repeater:

بەهێـزکەر، ئەم ئـامێرە بەهێـزکەرە، واتە کاتێـک زیـاتر لە ٥٠٠ مەتـر لەنێـوان نێتۆرکەکان بێت، لە نێوانیاندا ٢٥٠مەتردا ریپیەرێک دادەنێین بۆ ئەوەی خێرایەکەی زیادبکات. واتە تەنها بۆ بەهێزکردنی سینگناڵ بەکاردێت.




### 6- لان کارت Network Interface Card (NIC):

لان کارت ئەرکی گواستنەوەی زانیاریە لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر . LAN Card و NIC Cardیشـی پێـدەڵێن واتە Network Interface Card ، لان کارت پۆرتێکی هەیە پێی دەڵێن Ethernet وایەری Rj45ی پێوەدەبەسـترێت. لان کارت لەسەر مەزەبۆردی کەیسەکە دەبەسترێت.

هەر لان کارتیک ماک ئەدرەسـی تایبەت بە خۆی هەیە کەلـە هـیچ لان کـارتێکی تردا ئەو ژمارەیە دوبارە نیە، مـــاک ئەدرەس لە 6 بـــایت پێکهاتووە و گۆراوە بۆ Hexadecimal



جۆرێکی تری لێ دەبەسترێت
پێی دەڵێن BNC connector
لەوایەری Coaxial دروست دەکرێت.



## جیاوازی نێوان Switchو Hub :

- ئەگەر هاب بەکاربهێنین لە نێتۆرکدا کاتێک زانیاری و داتا دەنێرین بۆ کۆمپیوتەری ١ ئەو زانیاری و داتایانە دەچنە کۆمپیوتەرەکانی ترەوەو ئەو کات دەچێتە کۆمپیوتەری ١ ئەمەش کاتێکی زۆرتری دەوێت و لۆد لەسەر نێتۆرکەکە دروست دەکات.

+ هاب بۆ نزیکەی ٣٠ کۆمپیوتەر بەکاردێت، ئەگەر نیـتۆرکەکەت لە ٣٠ کۆمپیوتەر زیاتر بو نابێت هاب بەکاربهێنیت.

- ئەگەر سویچ بەکاربهێنین لە نێتۆرکدا کاتێک داتاو زانیاری دەنێرین بۆ کۆمپیوتەری ١ ئەوا راستەوخۆ دەچێت بۆ کۆمپیوتەری ١ ئەمەش خێراترە، کەواتە سویچ خێرایی زیاترە لە هاب و لۆدی زۆر لەسەر نێتۆرکەکە دروست ناکات.

+ لە سویچدا ماک ئەدرەس هەیە واتە ناونیشانی ئەو کۆمپیوتەرەی پێیە و تەنها زانیاری و داتا دەنێرێت بۆ ئەو کۆمپیوتەرەی ماک ئەدرەسەکەی لای سویچەکەیە.

ئەمەش جیاوازی هاب و سویچ، واتە سویچ خێراترە لە هاب لە گواستنەوەی داتاو زانیاری.

**لەم نمونەی خوارەوە زیاتر رونکراوەتەوە**

**لەهەردو حاڵەتەکەدا پاکێت لە F وە نێردراوە بۆ C**

ئەگەر سەرنج بدەیت Hub ەکە پاکێتەکەی ناردووە بۆ هەموو ئامێرەکانی تر ئەمەش بۆ نیتۆرکەکە باش نیە و خاوی دەکاتەوە، هەروەها بۆ حاڵەتی پارێزگاری نیتۆرکەکە باش نیە چونکە لەوانەیە مەسجێکی نهێنیت هەبێت نەتەوێت بچێتە هەمو ئامێرەکانی ترەوە کەواتە بۆ حاڵەتی هاککردن باش نیە

**وێنەکەی تر هەمان پاکێت لە F وە بۆ C بەڵام بەهۆی سویچەوە پاکێتەکە دەنێرێت**

پاکێتەکە راستەوخۆ چووە بۆ C نەچووە بۆ ئامێرەکانی تری گروپەکە، ئەمەش وادەکات نێتۆرکەکە خاو نەبێتەوە و پاکێتەکەش پارێزراو دەبێت لە هاککردن



A Switch sending a packet from F to C



A Hub sending a packet form F to C.

## -ئەكسس پۆینت Access Point:

ئەكسس پۆینت وەكو هاب و سویچ بەكاردێت، لە نیتۆركی وایەرلێسدا بەهۆی ئەو دوو ئاریەلەی هەیەتی دەتوانێت داتا وەربگرێت و داتا بداتەوە.




لەم بەشەدا نیتۆركێكی وایـەرلێس دروسـتكراوە و ئەكسـس پۆینـت بـەكارهاتووە، بەڵام بەشەكەی دەرەوە بە سویچ و وایەر نێتۆركێكی تر دروستكراوە

## -مۆدێم Modem:

مۆدێم، شەپۆلی دیجیتاڵی دەگۆرێت بۆ شەپۆلی ئەنەلۆك، یان بە پێچەوانەوە. وشەی مـۆدێم لـە دوو وشـەی Modulator شەپۆلی دیجیتاڵی دەكات بە شەپۆلی ئەنەلۆكی یان دەنگی و وشەی Demodulator شەپۆلی ئەنەلۆكی دەكات بە شەپۆلی دیجیتاڵی پێكهاتووە.






# پـرۆتۆکۆلــەکان ▪ Protocol

**پرۆتۆکۆل:** کۆمەڵێـک یاساو ڕێسایە کـار ئاسانی دەکـات بـۆ گواسـتنەوەی داتـاو زانیاریەکان، مرۆڤەکان بۆ گفتوگۆ زمان بەکاردێنن ئەگەر کەسێک زمان نەزانێت لەو کۆمەڵگایەدا کاروبارەکانی بۆ ناکرێت، پرۆتۆکۆلیش هەمان کـاریگەری هەیە واتە بـێ پرۆتۆکـۆل نێتـۆرک کارناکـات. هەر پرۆتۆکـۆلەو کـاری خـۆی دەکـات و لێپرسراوە لە کارێک.

کۆمپیوتەرەکان بە زمانی پرۆتۆکۆل لەیەکتر تێدەگەن، چەندین پرۆتۆکۆلی گرنگمان هەیە باسی دەکەین IPیەکێکە لە پرۆتۆلەکان.

پەیوەندییـە سـەرکەوتووەکانی نێـوان ئامێرەکـان بـەهۆی کۆمـەڵێک پرۆتۆکـۆلی جیاوازەوە دەبێت.




کۆمەڵێک پرۆتۆکۆل بەشدارن لەپەیوەندیەکاندا، پێی دەڵێن **Protocol Suite**

کۆکراوەی هەموو پرۆتۆکۆلەکان لەیەک ستاکدا پێی دەڵێن **Protocol Stack**

## کارەکانی Protocol Suite :

- بەرپرسە لەدیاریکردنی جۆری داتا تایبەکە
- بەرپرسە لەدیاریکردنی فۆرماتی مەسجەکە
- بەرپرسە لە چۆنیەتی ڕۆیشتنی داتاکان لەنێوان ئامێرەکاندا
- بەرپرسە لە کۆتایی هێنان و دەستپێکردنی پەیوەندییەکان



# Network Models

هەموو سیستمی نێتۆرک لەسەر ئەم مۆدێلانە کاردەکەن

دوو جۆر Network Modelsمان هەیە:

- Protocol Models
- Reference Models

Protocol Models: لەبواری ئینتەرنێتدا بەکاردێت لە کۆمەڵێک پرۆتۆکۆلی تایبەت پێکهاتووە نمونەش بریتیە لە :

Transmission Control Protocol/Internet Protocol (TCP/IP)

لەچوار چینی تایبەت پێکهاتووە کەهەر چینێک کارێکی تایبەت دەکات

Reference Models :

نمونەش بریتیە لە Open Systems Interconnection (OSI) :

لەحەوت چینی تایبەت پێکهاتووە کەهەر چینیک ئیشی تایبەتی خۆی دەکات



# TCP/IP Models

لەبواری ئینتەرنێتدا بەکاردێت، لەچوار چین پێکدێت، داتاکان بەم چینانەدا دەڕۆن بۆ ئامێری بەرامبەر، دوبارە لە کۆمپیوتەری بەرامبەر بەهەمان چیندا دەڕواتەوە بەڵام ئەمجارەیان لەخوارەوە بۆ سەرەوە واتە چی گۆرانکاری بەسەردا هاتووە گۆرانکاریەکان پێچەوانە دەکاتەوە هەتا ئەوکاتەی دەبێتەوە بە داتاکەی یەکەمجار و بەکارهێنەر دەیبینێتەوە




کاتێک داتا بەم چینانەدا دەڕوات دەبێت چەند هەنگاوێک ببڕێت و گۆرانکاری بەسەر داتاکاندا دێت

## هەنگاوەکانی ڕۆیشتنی داتا لە چینەکاندا:

- دروستکردنی داتا لەسەر چینی Application
- داتاکان پارچە پارچە دەبێت و دەپێچرێتەوە بۆ ئەوەی بەئاسانی بەناو ستاکدا بڕوات
- داتایەک لە Network Access دروست دەبێت بۆ ئەوەی بە ناوەندی گوێزەرەوەدا تێپەرێت
- داتاکە دەگوازرێتەوە بەناو ئینتەرنێتدا بۆ ئەمەش پێویستمان بە کێبڵ و ئامێر هەیە
- دواتر وەرگر لە چینی Network Access وەریدەگرێت
- هەڵوەشاندنەوەو کۆکردنەوەی داتاکان لەرێگەی ناونیشانێکەوە دەبێت کە پێوەیەتی
- پاشان داتاکان سەردەکەوێ بۆ چینەکانی تر تا دەگاتە چینی Application و دەبێت بە زانیاری (information)

## بەهەمو کارەکانی چینەکان دەوترێت Process Data Unit (PDU)

یان بریتیە لەو شێوازەی هەر بەشێک لەو داتایانە وەریـدەگرن لەسـەر چینـەکان واتە هەر داتایەک ناونیشانێک وەردەگرێت ناوەکەی دەگۆڕێت:

- **Data** - PDU used Application layer

**داتا** —داتا سەرەتا دەچێتە چینی حەوتەم ( Application layerلەیەکەم چین لەبەشی سەرەوە بەلاَم بە چینی حەوتەم دادەنرێت)

- **Segment** - Transport Layer PDU

**پارچە** –داتاکە دێتە چینی خواتر پارچە پارچە دەبێت

- **Packet** - Internetwork Layer PDU

**پاکێت** –لە چینی پێنجەمدا پارچەکان دەکرێنە پاکێتەوە

- **Frame** - Network Access Layer PDU

**فرەیم** –پاکێتەکان دەبنە فرەیم و پاش و پێشیان بۆ دروست دەبێت

- **Bits** - used a physically

**بت** –لە کۆتایدا فرەیمەکە دەبێت بە بت و فیزیکاڵ بۆ ئەوەی بەئاسانی بە ناوەندی گوێزەرەوەدا (کێبڵ یان، وایەرلس)بڕوات

– بەم شێوەیە داتاکە لە ئـامێری نێـرەرەوە دەچێـت بـۆ ئـامێری وەرگـر بـەلاَم لـە ئامێری وەرگر هەمو کردارەکان پێچەوانە دەبنەوە، ئێستا داتاکـە بـووە بـە سـنگاڵی کارەبایی و دەچێتە ئامێری بەرامبەر بەلاَم لە چینی یەکەمەوە واتە چینـی خـوارەوە دەچێت بۆ چینی سەرەوە (حەوتەم) لـە سـیگناڵەوە دەبێتـەوە بـە فـرەیم و دواتـر دەچێتە چینی سەروتر دەبێت بە پاکێت، دواتر دەچێتە چینی سەروتر و دەبێـت بـە پارچە پارچە، لە چینی سەرەوە واتە لـە کۆتایـدا دەبێتـەوە بـەداتا و وەرگـر وەکـو زانیاری دەیبینێت، هەمو ئەم کردارانە لەماوەیەکی زۆر کەمدا روودەدات.



## سـودەکانی ئـەم چینـانە چیـە:

- بەئاسانی ئەتوانین لە کرداری پەیوەندیەکان تێبگەین
- کۆمپانیاکان هەوڵ ئەدەن ستاندەرێک بۆ ئامێرەکان دابنێن کە دروستیان دەکەن
- ئەم چینانە رێگە دەدەن بەهاردوێرو سۆفتوێرە جیاوازەکان بەیەکەوە کاربکەن
- ئەم چینانە بووەتە هۆی کەمبونەوەی ئاڵۆزی

# The OSI Reference Model

**OSI** "Open Systems Interconnection".

بۆ حەوت چین دابەشکراوە هەموو پرۆتۆلەکان وەردەگرێت، بەهەمان شێوەی TCP/IPداتاکان گۆرانکاری بەسەردا دێت:




## Layer 7: Application Layer

ئەم چینە کۆمەڵێک پرۆتۆکۆلی تێدایە و هەریەکێک لەو پرۆتۆکۆلانە کارێک دەکەن :

- Hypertext Transfer Protocol (**HTTP**)
- File Transfer Protocol (**FTP**)
- Simple Mail Transfer Protocol (**SMTP**)

## کارەکانی چینی Application Layer بریتیە لە:

- دروستکردنی یاسا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی داتا لە نێوان نێرەر و وەرگردا
- پرۆتۆکۆلەکانی ناوی بەرپرسە لە دیاریکردنی جۆری مەسجەکە
- دیاریکردنی مەسج دایەلۆگ
- بەرپرسە لە کارلێکردنی نێوان چینی دوایی خۆی




# Layer 6: Presentation Layer

## کارەکانی ئەم چینە بریتیە لە:

- ئەو داتایەی لە چینی سەرەوە هاتۆتە ئەم چینەوە کۆدینی دەکات
- پەستان دەخاتە سەر داتاکان و بچوکیان دەکاتەوە
- کۆدینی داتاکان دەکات و لە ئامێری بەرامبەر دیکۆدینی داتاکان دەکاتەوە



# Layer 5: Session Layer

## کارەکانی ئەم چینە بریتیە لە:

- بەڕێوەبەری پەیوەندیەکان دەکات لە نێوان ئامێرە جیاوازەکاندا
- پەیوەندییەکان دەپارێزێت
- خەجت دەکاتەوە کە داتاکان گەیشتون بەوەرگر

ئـەم چینـە ڕێگـە ئـەدات بـە بەکارهێنـەرەکان لەسـەر ئـامێرە جیاوازەکـان بتـوانن پەیوەندی دروست بکەن




# Layer 4: Transport Layer

## کارەکانی ئەم چینە بریتیە لە:

بەرپرسە لە گواسـتنەوەی ئـەو داتايانـەی لـە نێـرەرەوە دەچێـت بـۆ وەرگـر و بـە پێچەوانەشەوە

داتاکـان پارچـە پارچـە (Segment)دەکـات، کۆکردنـەوەی پارچـەکان و کـۆنترۆڵی پارچەکان دەکات



# Layer 3: Network Layer

## کارەکانی ئەم چینە بریتیە لە:

- ناونیشان دەدات
- پێچانەوە
- دۆزینەوەی باشترین ڕێگا
- هەڵوەشاندنەوە

بەرپرسە لەکرداری Sub net، و بڕیاردەدات پاکێتەکان چۆن بڕوات لە نێرەرەوە بۆ وەرگر و بە پێچەوانەوە




# Layer 2: Data link Layer

پاکێتەکە ئامادە دەکات بۆ ئەوەی بگوازرێنەوە بەناوەندی گـوێزەرەوەدا، پاکێتـەکان دەکات بە فرەیم و دەیپێچێتەوە و پاش و پێشی بۆ زیاد دەکات

## ئەم چینە لە سێ بەش پێکهاتووە:

**Data** : داتاکە لە چینی پێشترەوە ( **Network Layer**)هاتووە

**Header** : زانیاری تەواوی تێدایە وەکو ناونیشان و لەسەرەتایی فرەیمەکەدایە

**Trailer**: زانیاری تەواوی تێدایە و لە کۆتایی فرەیمەکەدایە



## چینی Data Link Layer پێکهاتووه له دووبەش:

- :Logical Link Control

ئەم بەشە بەرپرسە له هەموو فرەیمەکان و بەرپرسە له دیاریکردنی پرۆتۆکۆلی Network Layer

- :Media Access Control

بەرپرسە له Addressingو بەرپرسە له سەرەتاو کۆتایی فرەیمەکە









# Layer 1: Physical Layer

بەرپرسە لە وزە و ئامێرەکان

**کارەکانی ئەم چینە بریتیە لە:**

- لە پێکهاتە فیزیاییەکان بەرپرسە
- ئینکۆدینی داتاکان دەکات
- داتاکان ئەکات بە سیگناڵی کارەبایی




L7 data
L7 data H6
L6 data H5
L5 data H4
L4 data H3
T2 L3 data H2
01010101010110101000001000

7 6 5 4 3 2 1

7 6 5 4 3 2 1

L7 data
L7 data H6
L6 data H5
L5 data H4
L4 data H3
T2 L3 data H2
01010101010110101000001000

Transmission medium

# ســێرڤەر (Server )

ســێرڤەر :ئامێرێکە (کۆمپیوتەرێکە)لە نێتۆرکدا بەکاردێت، زانیاری تێدایە دەتوانرێت Share بکرێت لەنێوان ئامێرەکاندا (Client)، سێرڤەر دەتوانێت ئامێرەکانی (client) تر کۆنترۆڵ بکات کە بەستراون بە نیتۆرکەکەوە، کۆمپانیای تایبـەت بـە مواسـەفاتی جیاواز دروستی دەکات زۆرجار کۆمپیوتەرێک لەبەر نـەبونی سـێرڤەر دەکرێـت بـە سێرڤەرو ویندۆی تایبەتی سێرڤەری لەسەر دادەبەزێنرێت.

سـێرڤەر مواسـەفاتی زۆر بـەزرترو جیـاوازترە لەکۆمپیوتـەری ئاسـایی نرخەکەشـی زۆرگرانترە، دەبێت رام و هاردو پرۆسێسەرەکەی زۆر بەرزتر بێت لە کۆمپیوتـەری ئاسایی، چونکـە چەنـد کارێـک دەکـات لەیـەک کاتـدا و خزمـەتگوزاری پێشکەشـی نێتۆرک و ئامێرەکان دەکات کە بەستراون بە نێتۆرکەکەوە.

نمونـە زۆرە لەسـەر سـێرڤەر بـۆ نمونـە سـێرڤەرەکانی گۆگـڵ یـان فەیسـبوک کـە پێکهـاتووە لـە چەنـدین سـێرڤەری گـەورە کـە خزمـەتگوزاری پێشکەشـی بەکارهێنەرەکانی دەکات کە ئەم سێرڤەرانە بیست و چوار کاتژمیر کاردەکەن نابێت بکوژێنەوە، هاردی زۆر گەورەیان هەیە بۆ خەزنکردنی داتاکان، چەندی پرۆسێسەر و ڕامی تایبەتیان هەیە .



**کڵاینت** :بریتیە لەو ئامێرانەی (کۆمپیوتەر)لە نیتۆرکدا هەیە، زانیاری و خزمەتگوزاری لە سێرڤەرەوە وەردەگرن، جۆرێکی نێتۆرک پێکهاتووە لە چەند کلاینتێک و یەک سێرڤەر جۆرەکەی تریان بێ سێرڤەرەوە تەنها لە کڵاینت پێکهاتووە هەر کلاینتێک بۆخۆی دەبێت بە سێرڤەر .



## ئەمانە بڕیاردەدەن لەسەر سێرڤەر کە ئەو سێرڤەرە چۆنە:

**Cpu — Cash memory — Ram — Cable bus - Register**

+سێرڤەر توانای خزمەتگوزاری هەیە بۆ بەکارهێنەران و دەتوانێ خێرایی باشمان بداتێ.
+سێرڤەر دەتوانێت بۆ ماوەیەکی دور درێژ کاربکات
+توانای هەیە ئین پوت و ئاوت پوتی I/Pباش بدات بە بەکارهێنەران
+هەتا ژمارەی ئامێرەکان (Client)ەکان زۆرتربن دەبێت
+مواسەفاتی سێرڤەرەکە بەرزتر و باشتر بێت.

## سێرڤەر دەبێت:

-جێی متمانە بێت بۆ بەکارهێنەرەکانی
-فرەهارد بێت واتە هاردی یەدەکی هەبێت بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێک لەهاردەکان لەکارکەوت ئەوی تر کارەکانی بۆ بکات و داتاکانی نەفەوتێت
-پاوەر سەپڵای یەدەکی هەبێت
-زۆرترین پانکەی هەبێت بۆ ساردکردنەوە
- Hot swappableی هەبێت ئەمەش رێگە ئەدات بە ئاڵوگۆرکردنی ئیشەکان نایەڵێ بکوژێتەوە بۆ نمونە گۆرینی هارد، ئەگەر هاردێک لەکارکەوت خۆی ئۆتۆماتیک دەچێتە سەر هاردە یەدەکەکەو بەکاریدەهێنێت بەمەش سێرڤەرەکە ناکوژێتەوە
-دەبێت ئەو ژورەی سێرڤەرەکەی تیایە ئیرکۆندێشنی تیابێت بۆ ساردکردنەوە چونکە سێرڤەرەکە بەردەوام کاردەکات ئەمەش وا دەکات گەرم بێت

+زۆربەی سێرڤەرەکان فلاتن واتە تەختن بۆ ئەوەی بەئاسانی جێگەی ببێتەوە لە ڕەکەکەدا
+دەتوانێت لە دورەوە لەڕێگەی ریمۆتەوە سێرڤەرەکە بەرنامە بکەیت
لەڕێگەی تەکنیکی **out of band management** لە شوێنێکی دورەوە و بەریمۆت کۆنترۆڵ بکرێت
ئەم تەکنیکە پشت دەبەستێت بەپارچەیەک هاردوێر لە سێرڤەردا بەناوی **IPMI - Intelligent Platform Management Interface**
+دەبێت بەلایەنی کەمەوە ئینتەرفەیسەکانی کەمتر نەبێت لە گێگا بایت

-زۆربەی سێرڤەرەکان شوێنی کیبۆرد و ماوسی نیە ئەویش لەبەر پارێزگاریە لە زانیاریەکانی ناو سێرڤەرەکە بۆ ئەمەش پشت دەبەستین بە IPMI

-لە سێرڤەردا دەبێت رامی زۆر خێرامان هەبێت بۆ ئەوەی خێرایی باشمان بداتێ و کارەکانمان بەباشی بۆبکات چونکە سێرڤەر لەیەک کاتدا چەندین کار دەکات

-سێرڤەر کۆمەڵێک هاردی تێدایە بەڵام کاتێک سەیری دەکەین وەکو یەک هارد دیارە لەناو یەکتریدا بەمەش دەڵێن RAID

-RAID: بریتیە لە کۆمەڵێک هارد بۆ پاراستنی سێرڤەرەکەیە لە کاتێکدا ئەگەر هاردێک کێشەی هەبێت جێگرەوەی تری هەیە و ئاڵوگۆر دەبێت بۆ هاردێکی ترو سێرڤەرەکە لە ئیشکردن ناوەستێت و داتاو زانیاری لەناو ناچێت .




<u>لەسێرڤەردا ئەو سیستمانە هەیە:</u>

- Mac os x Server
- Microsoft Server
- Linux











ناوەرۆک و بەشەکانی سێرڤەر




سێرڤەر کۆمەڵێک هاردی تێدایە کاتێک سەیری دەکەین
وەکو یەک هارد دیارە لەناو یەکتریدا, بەمەش دەڵێن RAID

---

سێرڤەر ئامێرێکە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری و کۆنترۆڵکردنی ئامێرەکانی سەر نێتۆرکەکە

**ئامێرەکانی تری سەر نێتۆرکەکە ژمارەکەی هەرچەند بێت پێی دەڵێن کڵاینت یان :**

+هەر ئامێرێک داوای زانیاری بکات پێی دەڵێن کڵاینت

+هەر ئامێرێک وەڵامت بداتەوە پێی دەڵێن سێرڤەر




+هەرشتێک لە سێرڤەرەوە وەربگریت داونلۆدە

+هەر شتێک لە کڵاینتەوە چو بۆ سێرڤەر پێی دەڵێن ئەپلۆد

+هەندێ لە سێرڤەرەکان پێویستیان بە یوزەرئەکاونتو پاسۆرد هەیە بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بەکارهێنەرەکانی بکات

+سێرڤەر لەیەککاتدا توانای هەیە کۆمەڵێ داواکاری وەربگرێت

+ سێرڤەر بەرپرسە لە جیاکردنەوە هەموو داواکاریە تاکیەکان کەبۆی هاتووە

+MTA سۆفتوێرێکە بەرپرسە لە وەرگرتن و وەڵامدانەوەی هەمو ئەو نامانەی بۆ سێرڤەرەکە دێت

+MUA سۆفتوێرێکە بەرپرســـــــە لــــە وەرگــــــرتن و وەڵامدانەوەی هەموو ئەو نامانەی بۆ کلاینتەکان دێت

+پرۆتۆکۆلی SMTP بەکاردەهێنرێت بۆ ناردنی نامە

+پرۆتۆکۆلی POPبۆ وەرگرتنی نامە بەکاردەهێنرێت







+ئەگەر سیستمەکە سێرڤەری ناوخۆیی بو نەبەسترابو بە ئینتەرنێتەوە ئەوا MDA بەکاردەهێنرێت بۆ ئاڵوگۆرکردنی نامەکان

ئەگەر سیستمەکە ناوخۆیی نەبو لەم کاتەدا پێویستمان بە MDAنیە تەنها MTA بەکاردەهێنین

<u>کارەکانی MDA:</u>

- پشکین بۆ نامەکان دەکات بزانێت ڤایرۆسی پێوەنیە
- کاتێک نامە دەنێرێت زیاتر دڵنیایی دەکاتەوە لە ناردنی نامەکە کە رۆیشتووە

## <u>پ/سێرڤەر چۆن ئایپی ئەدات بە کلاینەتەکان؟</u>

و/DHCP لەسەر سێرڤەر هەڵدەستێت بە پێدانی ئایپی ئەدرەس بەهەمو کلاینتەکان واتە ئۆتۆماتیک هەمو کلاینتەکان ئایپی خۆیان وەردەگرن لە سێرڤەرەوە

بەڵام ئەگەر DHCP نەبێت دەبێت بەدەستی ئایپی بدەیت بەیەک بەیەکی کلاینتەکان

# جیاوازی نێوان peer ـtoـ peer و Client Server

**Client Server ـ:** بریتیە لە نێتۆرکێک سێرڤەری تێدایە و سێرڤەر کۆنترۆڵی کلاینتەکان دەکات و سێرڤەر زانیاری ئەدات بە کلاینتەکان ئەم جۆرە لەسەر شێوازی ناردن و وەڵامدانەوە کاردەکات واتە کلاینتەکان سیگناڵ دەنێرێت بۆ سێرڤەر، سێرڤەریش وەڵامدەداتەوە،



Client/server

بۆ نمونە ئەگەر پرنتەرێک بەسترابێت بە سێرفەرەکەوە و تۆش بتەوێت کاغەزێک چاپ بکەیت، دەبێت داوا لە سێرڤەر بکەیت بۆت چاپ بکات، سێرڤەرەکەش دەینێرێت بۆ پرنتەرکە و کاغەزەکە چاپ دەکات، ناردنی ئیمەیڵ و داواکردنی سایتێک بەهەمان شێواز دەکرێت، هەمو سایتەکانی وەکو گۆگڵ و فەیسبوک خاوەنی سێرڤەری تایبەتی خۆیانن تۆی بەکارهێنەر داوایەک دەنێریت و ئەویش وەڵامت بۆ دەنێرێتەوە، ئەم نێتۆرکە پارێزراو و باشترە، هەردوو پرۆتۆکۆلی SMTP بۆ ناردن و پرتۆکۆلی POP بۆ وەرگرتنەوە بەکاردەهێنرێت

**Peerـtoـpeerـ:** سێرڤەری تێدانیە هیچ کۆمپیوتەرێک کۆنترۆڵی ئەوانی تر ناکات و هەمو کۆمپیوتەرێک بۆخۆی سەربەخۆییە هەر کۆمپیوتەرێک سێرڤەرەوە لەهەمان کاتیشدا کلاینتە بەڵام هیچ کۆمپیوتەرێک ناتوانێت کۆنترۆڵ و چاودێری کۆمپیوتەرەکانی تر بکات ئەم جۆرە نێتۆرکە سکیوریتی لاوازە.



Peer-to-peer

لەم نیتۆرکەدا هەر کۆمپیوتەرە ناو و پاسۆردی تایبەت بەخۆی هەیە بەڵام لە نیتۆرکی سێرڤەردا، سێرڤەر پاسۆرد بۆ کلاینتەکان دادەنێت

## فۆرمات و دابەزاندنی ویندۆز سێرڤەر:

ئەگەر ویستت کۆمپیوتەرەکەت فۆرمات بکەیت بە ویندۆی سێرڤەر دەبێت ویندۆیەکی سێرڤەر پەیدا بکەیت و فۆرماتی بکەیت

ئەگەر شارەزای فۆرمات بیت زۆر بەئاسانی دەتوانیت ویندۆی سێرڤەر دابەزێنیتە سەر سێرڤەر یان کۆمپیوتەرێک.

هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ شێوازی دابەزاندنی ویندۆز بۆ سەر کۆمپیوتەر




سیدی ویندۆکە دەخەیتە ناو درایڤەکەوە و ریستارتی کۆمپیوتەرەکە دەکەیت دواتر دەست دەخەیتە سەر دوگمەی Deleteیان F9یان F4یان دوگمەیەکی تر چونکە بەپێی کۆمپیوتەر دەگۆڕێت دواتر هەلبژاردەت دێتە بەردەست سیدی یـــــان دیڤیدی هەڵدەبژێریت و ئینتەر دەکەیت




دواتر ئەم شاشە رەشەت بۆ دێت تۆش ئینتەر بکە بۆ ئەوەی فۆرماتەکەت بۆ بکات




لێرەوە ویندۆکە دادەبەزێت و هەنگاوەکان دەڕۆن بەرەو کۆتایی

پاشان ئەم خشتەیە دەکرێتەوە لێرەدا زمانەکە هەڵبژێرە و Nextبکە







Install Windows
Select the operating system you want to install
Operating system
Architecture
Date modified
Windows Server 2008 R2 Standard (Full Installation) x64 7/14/2009
Windows Server 2008 R2 Standard (Server Core Installation) x64 7/14/2009
Windows Server 2008 R2 Enterprise (Full Installation) x64 7/14/2009
Windows Server 2008 R2 Enterprise (Server Core Installation) x64 7/14/2009
Windows Server 2008 R2 Datacenter (Full Installation) x64 7/14/2009
Windows Server 2008 R2 Datacenter (Server Core Installation) x64 7/14/2009
Windows Web Server 2008 R2 (Full Installation) x64 7/14/2009
Windows Web Server 2008 R2 (Server Core Installation) x64 7/14/2009
Description:
This option installs the complete installation of Windows Server. This installation includes the entire user interface, and it supports all of the server roles.
3
پاشان Nextبکە
Next


Install Windows
4
Please read the license terms
MICROSOFT SOFTWARE LICENSE TERMS
MICROSOFT WINDOWS SERVER 2008 R2 ENTERPRISE
These license terms are an agreement between Microsoft Corporation (or based on where you live, one of its affiliates) and you. Please read them. They apply to the software named above, which includes the media on which you received it, if any. The terms also apply to any Microsoft
updates,
supplements,
Internet-based services, and
support services
نیشانەی راست بدە لەم
چوارگۆشەیە و Nextبکە
I accept the license terms
Next


Install Windows
Which type of installation do you want?
5
Upgrade
Upgrade to a newer version of Windows and keep your files, settings, and programs. The option to upgrade is only available when an existing version of Windows is running. We recommend backing up your files before you proceed.
Custom (advanced)
Help me decide
ئەم بەشە کلیک بکە


Install Windows
Where do you want to install Windows?
6
Name
Total Size
Free Space
Type
Disk 0 Unallocated Space
24.0 GB
24.0 GB
ویندۆکە دادەبەزێتە ناو ئەو
هارددرایفەی کەدیارە
و Nextبکە
Refresh
Load Driver
Drive options (advanced)
Next







+ویندۆکە بە سەرکەوتویی دابەزی و کۆتایی هات

+ئێستا پاسۆرد بۆ سێرڤەرەکە دادەنێین

+پاسۆردی سێرڤەر نابێت سادە بێت دەبێت کۆمەڵێک وشەو هێماو ژمارە تێکەڵ بکەیت

# دروستکردنی Domain Name:

ئێستا دەتوانین ئیش لەسەر ویندۆکە بکەین و دۆمەین دروست بکەین ئەگەر دۆمەینمان نەبێت ناتوانین ئیش لەسەر سێرڤەرەکە بکەین و کۆنترۆڵی ئامێرەکانی تر بکەین کەبەستراون بە نێتۆرک و سیرڤەرەکەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەبێت Active Directory چالاک بکەم ئەوکات دەتوانم دۆمەین دروست بکەین، ئێستا هەنگاو بەهەنگاو باسی دەکەین:

دەچینە سەر Star ئەم لیستەی خوارەوە دەکرێتەوە




دووەمجار کلیک لەسەر ئەم ئایکۆنە بکە

Server Manager

File Action View Help

Server Manager (8R2-
Roles
Features
Diagnostics
Configuration
Storage

Roles

View the health of the roles installed on your server and add or remove roles and features.

Roles Summary — Roles Summary Help

Roles: 1 of 17 installed

Add Roles
Remove Roles

کلیک لەسەر ئەم ئایکۆنە بکە

Web Server (IIS) Help

Web application infrastructure.

Role Status — Go to Web Server (IIS)

Messages: None
System Services: All Running
Events: None in the last 24 hours
Best Practices Analyzer: To start a Best Practices Analyzer scan, go to the Best Practices Analyzer tile on this role's homepage and click Scan this Role

Last Refresh: Today at 7:32 PM Configure refresh




Add Roles Wizard
Confirm Installation Selections
Before You Begin
Server Roles
Active Directory Domain Services
Confirmation
Progress
Results
To install the following roles, role services, or features, click Install.
2 informational messages below
This server might need to be restarted after the installation completes.
Active Directory Domain Services
After you install the AD DS role, use the Active Directory Domain Services Installation Wizard (dcpromo.exe) to make the server a fully functional domain controller.
.NET Framework 3.5.1 Features
.NET Framework 3.5.1
کلیک لەسەر
ئەم ئایکۆنە
بکە
Print, e-mail, or save this information
< Previous
Next >
Install
Cancel


ئێستا چاوەروان
بکە هەتا تەواو
دەبێت
Installing...
< Previous
Next >
Install
Cancel

ئێستا کرد چالاک مان Active Directory

# دۆمەین دروست دەکەین




لە Runدا بنوسە

Dcpromo

Ok بکە

ئەم خشتەیەی خوارەوە دەکرێتەوە




Active Directory Domain Services Installation Wizard
Choose a Deployment Configuration
You can create a domain controller for an existing forest or for a new forest.
Existing forest
Add a domain controller to an existing domain
Create a new domain in an existing forest
This server will become the first domain controller in the new domain.
Create a new domain in a new forest
More about possible deployment configurations
ئەم بەشە هەڵبژێرە
< Back
Next >
Cancel


Active Directory Domain Services Installation Wizard
Name the Forest Root Domain
The first domain in the forest is the forest root domain. Its name is also the name of the forest.
Type the fully qualified domain name (FQDN) of the new forest root domain.
FQDN of the forest root domain:
howtogeek.local
Example: corp.contoso.com
لەم بۆشایەدا ناوی دۆمەینەکە بە پاشگرەوەکە بنوسە
لەدوایدا کلاّینەکان بەم ناوەوە دەبەسترێن بە سێرڤەرەوە
پاشانNextبکە
< Back
Next >
Cancel




Active Directory Domain Services Installation Wizard

**Location for Database, Log Files, and SYSVOL**

Specify the folders that will contain the Active Directory domain controller database, log files, and SYSVOL.

For better performance and recoverability, store the database and log files on separate volumes.

Database folder:

C:\Windows\NTDS — Browse...

Log files folder:

C:\Windows\NTDS — Browse...

SYSVOL folder:

C:\Windows\SYSVOL — Browse...

More about placing Active Directory Domain Services files

ئەم بەشە بۆ خەزنکردنی شوێنی داتابەیسەکانە
تۆ دەستکاری مەکە و پاشان Nextبکە

< Back | Next > | Cancel

Active Directory Domain Services Installation Wizard

Directory Services Restore Mode Administrator Password

The Directory Services Restore Mode Administrator account is different from the domain Administrator account.

Assign a password for the Administrator account that will be used when this domain controller is started in Directory Services Restore Mode. We recommend that you choose a strong password.

Password:

Confirm password:

More about Directory Services Restore Mode password

لێرەدا پاسۆرد بۆ دۆمەینەکەت دادەنێیت

دواى nextکردن کەمێک چاوەروان بکە

پاشان Nextبکە

< Back | Next > | Cancel

Active Directory Domain Services Installation Wizard

Completing the Active Directory Domain Services Installation Wizard

Active Directory Domain Services is now installed on this computer for the domain "howtogeek.local".

This Active Directory domain controller is assigned to the site "Default-First-Site-Name". You can manage sites with the Active Directory Sites and Services administrative tool.

To close this wizard, click Finish.

دواى چاوەروانیەکە، دروستکردنى دۆمەین تەواوبو finishبکە و کۆمپیوتەرەکە ریستارت دەبێتەوە

< Back | Finish | Cancel

# دروستكردنی بەكارهێنەر (User) لەسەر سێرڤەر




دواتر كلكیك لەسەر ئەم بەشە دەكەیت و

ئەو خشتەیەی خوارەوە بۆ دەكرێتەوە

پاشان لە Starوە كلیك لەسەر ئەم بەشە دەكەیت






پاشان دەچینە سەر بەشی
userکلیکی راست
دەکەین و new
هەلدەبژێرین دواتر کلیک
لەسەر userدەکەین بۆ
دروستکردنی بەکارهێنەرێک
لەسەر سێرڤەرەکە، ئێمە
دەتوانین چەندەها بەکارهێنەر
دروست بکەین لە سێرڤەرەکە
خزمەتگوزاریان پێشکەش
بکرێت لەلایەن سێرڤەرەکەوە
و کۆنترۆڵی بکەین. ئەم
هەنگاوەکانە بۆ دروستکردنی
یەک بەکارهێنەر دەتوانین
چەندینی تر دروست بکەین



New Object - User

Create in: contoso.local/Users

First name: SQLService Initials:
Last name:
Full name: SQLService
User logon name:
SQLService @contoso.local
User logon name (pre-Windows 2000):
CONTOSO\ SQLService

< Back Next > Cancel

لەخانەی یەکەم ناوی خۆت بنوســـە

لەخانەی خوارتـــرناوی دووەمت بنوسە

لەخانەی سێیەم ناوی خۆت بە تەواوی بنوسە

لەخانەی خوارتر ناوێک بنوسە دواتر بەو ناوە داخڵ دەبیت، وەکو ئیمەیڵ وایە بۆتۆ

<u>کاتێک دەچیتە سەرکۆمپیوتەرێکی تر بەو ناوەوە دەچیتە ناوەوە و دەبێت بە خاوەنی ناو و پاسۆردی تایبەت بە خۆت بەڵام لەژێر کۆنترۆڵی سێرڤەرەکەدا</u>

پاشان Nextبکە

Password:

Confirm password:

User must change password at next logon

User cannot change password

Password never expires

Account is disabled

< Back Next > Cancel

لەم دوو خانەیەدا پاسۆردی بەکارهێنەرەکە دەنوسیت کە لەخانەی پێشەوە ناویمان تۆمارکردووە

ئەم بەشە لە خشتەکەی سەرەوەدا هەیە دەبێت دانەکیان هەڵبژێریت ئێستا باسی دەکەین ئەم هەڵبژاردانە چین

User must change password at next logon

User cannot change password

Password never expires

Account is disabled

- بەشی یەکەم: واتە بەکارهێنەر دەتوانێت پاسۆردەکە بگۆرێت
- بەشی دووەم: واتە بەکارهێنەر ناتوانێت پاسۆرد بگۆرێت
- بەشی سێیەم : پاسۆردەکە هەرگیز بەسەرناچێت
- بەشی چوارەم: ئەم ئەکاونتە بتوانرێت دابخرێت

## بەستنی کۆمپیوتەر (Client)بە سێرڤەرەکەوە:

ئێستا ئێمە بەکارهێنەرێکمان (USER)دروستکردوە، ناو و پاسۆردی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەگەر بچیتە سەرکۆمپیوتەرێکی تر دەبێت بەو پاسۆردو ناوەوە داخل بیت کە پێس ئێستا دروست کردووە

**بەڵام دەبێت پێشتر چەند هەنگاوێک هەیە جێبەجێی بکەیت :**

- ئایپی ئەدرەس دەدەین بە کۆمپیوتەرەکە
- ناوی کۆمپیوتەرەکە دەگۆڕین (لە جیاتی دیاریکردنی ناوی گروپ لەم حاڵەتەدا ناوی دۆمەینەکە بنوسە کەلەسەر سێرڤەرەکە دروست کردوە)
- دوای ئەم هەنگاوانە داوای ناوو پاسۆردەکەت لێ دەکات کەلەسەر سێرڤەرەکە دروست کردووە بۆ بەکارهێنەر (USER)
- دواتر کۆمپیوتەرەکە ریستارت دەبێتەوە
- پاشان داگیرسایەوە Log offی بکە
- دوو خانە دێتە بەردەمت نا و پاسۆردەکە بنوسەرەوە

لەلاپەرەکانی تردا بەوێنەوە باشتر رونی دەکەینەوە






دواى ناونانى كۆمپيوتەرەكە
ئەم خشتەيە دەكرێتەوە
لەخانەى يەكەم ناوى
بەكارهێنەرەكە بنوسە
كەلەسەر سێرڤەرەكە
دروستت كردووە
لەخانەى دووەم
پاسۆردەكەى بنوسە
پاشان okبكە

دواى ئەم هەنگاوە
كۆمپيوتەرەكە ريستارت
دەبێتەوە







دواى ريستارتەكە ئەم شێوازە دەرئەكەوێت
لەسەر كيبۆردەكە دەست بنێ بە هەرسێ
دوگمەى Ctrl+Alt+Delete

ئەو خشتەيە دەكرێتەوە و
ناوو پاسۆرد داخڵ بكە و
بچۆرە ناوەوە

# IP Address

IP Address‾ کـورتکراوەی وشـەی Internet Protocol کاتێـک کۆمپیوتەرێـک دەبەسترێت بە نێتۆرکەوە دەبێت IPی خۆی هەبێت، بەهۆی IPیەوە داتاو و زانیاری لەنێوان کۆمپیوتەرەکانـدا ئاڵوگۆڕدەکرێت، IPی هـیچ کۆمپیوتەرێـک لە کۆمپیوتەرێکی تر ناچێت.

IP ژمارەیەکە پێکهاتووە لە چواربەش پێی دەوترێت Octet ی و هەشتی هەربەشێک لە ژمارەکان 8 Bitی باینەریە واتە هەرچوار ژمارەکە Bit32 ی




بۆ ئاسانکاری بەشێوەی دەیی (ژمارەی دەیی) دەردەبڕێت، بۆ نمونە 192·168·1·1 بەڵام لەراستیدا هەر ژمارەیەک لەوانە ٨ بتەو کۆی هەر چوار ژمارەکە ٣٢ بتی باینەرییە.

**هەربەشێک (Octet) لەوانەیە لە 1‾255 بێت**

| | Range for first byte |
|---|---|
| Class A | 0 - 127 |
| Class B | 128 - 191 |
| Class C | 192 - 223 |
| Class D | 224 - 239 |
| Class E | 240 - 255 |

**IPبۆ کاری ئاسانی پۆلێن کراوە بۆ چەند بەشێک بەهەر بەشێک دەوترێت Class**
**Class A ‾ Class B ‾ Class C**
**Class D ‾ Class E**

## ژمارەی نێتۆرک و ئامێرەکان (Host) لەم خشتەیەدا رونکراوتەوە:

| Class | Starts with | Binary range | Decimal Value range | Maximum subnets | Maximum hosts | Routing mask |
|---|---|---|---|---|---|---|
| A | 0 | 00000000-01111111 | 0-127* | 127 | 16,777,214 | 255.0.0.0 |
| B | 10 | 10000000-10111111 | 128-191 | 16,384 | 65,534 | 255.255.0.0 |
| C | 110 | 11000000-11011111 | 192-223 | 2,097,152 | 254 | 255.255.255.0 |
| D | 1110 | 11100000-11101111 | 224-239 | | | |
| E | 1111 | 11110000-11111111 | 240-255 | | | |

| Class A Subnet Mask | Netwok | Host | Host | Host |
|---|---|---|---|---|
| | 255 | 0 | 0 | 0 |

| Class B Subnet Mask | Netwok | Network | Host | Host |
|---|---|---|---|---|
| | 255 | 255 | 0 | 0 |

| Class C Subnet Mask | Netwok | Network | Network | Host |
|---|---|---|---|---|
| | 255 | 255 | 255 | 0 |

## چۆنیەتی دەرهێنانی ئەو هاوکێشەیە؟

وەک باسمانکرد IP لە چواربەش (Octet) پێکهاتووە لەهەر کلاسێکدا بەشێک بۆ Network و بەشێکی تری بۆ Hostە وەک لەو وێنەیەدا دیارە.
ئەگەر باسی کلاسیA بکەین یەک Octetبۆ نێتۆرکە و سێ Octet بۆ ئامێرە (Host).

| IP Address Class | Total # Of Bits For Network ID / Host ID | First Octet of IP Address | # Of Network ID Bits Used To Identify Class | Usable # Of Network ID Bits | Number of Possible Network IDs | # Of Host IDs Per Network ID |
|---|---|---|---|---|---|---|
| Class A | 8 / 24 | 0xxx xxxx | 1 | 8-1 = 7 | $2^7$-2 = 126 | $2^{24}$-2 = 16,277,214 |
| Class B | 16 / 16 | 10xx xxxx | 2 | 16-2 = 14 | $2^{14}$ = 16,384 | $2^{16}$-2 = 65,534 |
| Class C | 24 / 8 | 110x xxxx | 3 | 24-3 = 21 | $2^{21}$ = 2,097,152 | $2^8$-2 = 254 |

- کڵاسی A لە نێتۆرکە گەورەکاندا بەکاردێت، ISP دەتوانێت لەسەر ئەم کڵاسە ئیش بکات
ئەم کڵاسە دەتوانێت ١٦ ملیۆن ئایپی بفرۆشێت لەیەک نێت و سێ هۆست پێکهاتووە.
- کڵاسی B سەپۆرتی ٦٥ هەزار هۆست دەکات، لە دوو نێت و دوو هۆست پێکهاتووە
- کڵاسی C سەپۆرتی ٢٥٤هۆست دەکات، لە سێ نێت و یەک هۆست پێکهاتووە
- کڵاسی DوE لە سیستمی تایبەتدا بەکاردێت.

## جۆرەکانی Address:

1-Network Address 2-Broadcast Address 3-Host Address

Address Types

| | Network | | | Host |
|---|---|---|---|---|
| Network Address | 10 | 0 | 0 | 0 |
| | 00001010 | 00000000 | 00000000 | 00000000 |
| Broadcast Address | 10 | 0 | 0 | 255 |
| | 00001010 | 00000000 | 00000000 | 11111111 |
| Host Address | 10 | 0 | 0 | 1 |
| | 00001010 | 00000000 | 00000000 | 00000001 |

# جۆرەکـــانی IP:

**1-Public:**

زۆربەی ئایپیەکان لەم جۆرەن، ئەم جۆرەیان لە ئینتەرنێتدا بەکاردەهێنرێت، کۆمپانیاکان دەیفرۆشن، هەموکەس دەتوانێت ئایپی بۆخۆی بکرێت و بەکاری بهێنیت.

**2-Private:**

ئەم جۆرەیان تایبەتە بە نێتۆرکە ناوخۆییەکان و هەموکەس دەتوانێت بەکاری بهێنێت، پێویست ناکات لە هیچ کۆمپانیاو سەنتەرێک بیکڕێت.

**Static:** بریتیە لەو ئایپیەی کە خۆت داخڵی دەکەیت و ژمارەی پێدەدەیت

**Dynamic:** بریتیە لەو ئایپیەی کەخۆی داخڵ دەبێت واتە ئۆتۆماتیک خۆی ژمارەی ئایپی دەدات بە کۆمپیوتەرەکان.

## چۆنیەتی دانانی IP Address بۆ کۆمپیوتەر بەشێوەی Static:

-دانانی IP بە شێوەی Static واتە خۆت ئایپی دەدەیت بە کۆمپیوتەرەکان:

سەرەتا دەچینە کۆنترۆڵ پەناڵ، دواتر کلیک لەسەر ئایکۆنی Network and Sharing Center پاشان کلیک لەسەر Change adapter settings دەکەین و کلیکی لای راست لەسەر Local Area دەکەین

بەڵام ئەگەر نێتۆرکی وایەرلێس بو ئەوا کلیک لەسەر Wireless Network دەکەین، دواتر کلیک لە Status دەکەین خشتەیەک دەکرێتەوە



کلیک لەسەر Properties دەکەین و خشتەیەکی تر دەکرێتەوە و دەبڵ کلیک لەسەر

Internet Protocol 4(TCP\Ipv4)

دەکەین خشتەیەکی تر دەکرێتەوە و لەوێدا ئایپی داخڵ دەکەین




لەم خشتەیەدا IP Address داخڵ دەکەین

ئۆپشنی Obtain an ip address automatically بۆدانانی ئایپی بەشێوەی ئۆتۆماتیکی (Dynmic) دادەنێت بۆ کۆمپیوتەرەکە.

ئۆپشنی خوارتر Use the following ip address بۆ دانانی ئایپیە کە خۆت دایبنێیت(Static) بۆ کۆمپیوتەرەکان.

ئۆپشنی خوارتر use the following DNS server address ئەگەر سێرڤەرت هەبو لێرەدا ئایپی بۆ دادەنێین.



## MAC Address

MAC كورتكراوەی وشەی Media Access Control لە سێ بەش پێک دێت و هەربەشێک چوار ژمارە لە خۆ دەگرێت، بۆ نمونە 0330.2123.1212 ماک ئەدرەس لەسەر لان کارت هەیە، هەرلان کارتێک ماک ئەدرەسی خۆی هەیە هیچ ماک ئەدرەسی لان کارتێک لە ماک ئەدرەسی لان کارتێکی تر ناچێت، کاتێک داتایەک دێتە ناو کۆمپیوتەرێکەوە لەرێگەی لان کارتەوە دەبێت ناونیشانێکی پێبێت و بیگەیەنێتە شوێنی خۆی، ئەو ناونیشانەش لەرێی ماک ئەدرەسەوە دەبێت.

**ئامێری Bridge لەسەر بنچینەی ماک ئەدرەس کاردەکات.**




## Subnet Mask

بریتە لە ژمارەیەکی تایبەت، کە هەر کلاسێک یەک Subnetmask ی تایبەت بەخۆی هەیە، پرۆتۆکۆلیکی تایبەت هەڵدەستێک بە گۆرینی ئایپی ئەدرەس بۆ Subnetmask ئەمەش بۆ ئەوەیە لان کارتەکە بیناسێتەوە چونکە لان کارت ئایپی ئەدرەس ناناسێتەوە، ئەگەر دو نێتۆرکی جیاوازمان هەبێت و بەراوتەر پێکەوەبەسترابن، دەبێت Subnetmask مان هەبێت، واتە کاتێک داتا لە نێتۆرکێک دەنێریت بۆ نێتۆرکی بەرامبەر پرۆتۆکۆلێک هەڵدەستێت بە گۆرینی ئایپی ئەدرەس بۆ Subnetmask بۆ ئەوەی لان کارتی سەر ئامێرەکانی نێتۆرکی بەرامبەر، بزانێت داتایەک هاتووە لە نێتۆرکی بەرامبەرەوە.

**هەر** Subnetmask ێک سیگناڵی کارەبای تایبەت بەخۆی هەیە دەنێرێت بۆ نێتۆرکی بەرامبەر.

### Default Subnet Mask

CLASS A - 255.0.0.0

CLASS B - 255.255.0.0

CLASS C - 255.255.255.0

# پێداویستیەکان بۆ بەستنی هۆڵێکی نیتۆرک

بمانەوێت هۆڵێکی نێتۆرک دروست بکەین دەبێت ئەم پێداویستیانەمان هەبێت:

1-دیزاینی نێتۆرکەکە




2-Race Way: کەڤەری وایەرەکان، ئەم کەڤەرە بۆ داپۆسینی وایەرەکان بۆ ئەوەی دەرنەکەون نەکەونە بەر قاچ و مێز بڵاو نەبێتەوە



3-Wall Jack: لە شێوەی سویچ پلاکدایە بۆ دابەشکردن بەکاردێت




4-Cable: دەبێت کێبڵمان هەبێت بۆ پەیوەستکردنی ئامێرەکان پێکەوە



5-Patch Panel: ئامێرێکە لەرەکدا بەکاردێت کۆمەڵێک پۆرتی هەیە، کێبڵی نێتۆرکەکەی پێوە پەیوەست دەکەین،کێبڵەکان دەگەینێت بە سویچ و هاپ



6-Switch: ئەگەر پێویستمان بە ئامێری سویچ بوو دەبێت بەکاریبێنین



7-Patch Cable: وایەرێکە لەناو رەکدا بەکاردێت بۆ بەستنەوەی Patch Panel بە Switch ەوە



8-Cable Management : بۆ کۆکردنەوەی وایەرەکان بەکاردێت



9-Rack: بۆ پاراستنی ئامیرەکانی سویچ یان هاب و راوتەر و کێڵەکان بەکاردێت



# پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەر بە وایەر

کاتێک بمانەوێت دوو کۆمپیوتەر پێکەوە ببەستین بۆ مەبەستی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و داتا ئەوا پێویستە:

**-دوو کۆمپوتەرمان هەبێت**

**-لان کارت لە هەردوو کۆمپیوتەرەکەدا هەبێت و ناسێنرابێت**

**-ئاپی ئەدرەسمان هەبێت**



# چۆن بزانین لان کارتمان هەیە لەسەر کۆمپیوتەرەکە

بۆ ئەوەی دڵنیابین ئایا کۆمپیوتەرەکەمان لان کارتی تێدایە یان نا، یان لان کارتەکە ناسێنراوە بە کۆمپیوتەرەکە بەم رێگایە دڵنیا دەبین:

دەچینە سەر Control panel پاشان Network and Sharing Center هەڵدەبژێرین، پاشان بەشێکمان پیشان دەدات لەم بەشەدا دەردەکەوێت لان کارتمان هەیە یان نیمانە ئێستا لەسەر ئەم کۆمپیوتەرەی ئێمە لان کارتی وایەرو لان کارتی وایەرلسمان هەیە، ئەگەر ویستمان پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەرەکە بەوایەر بێت ئەوا کلیکی راست

Ethernet
Disabled
At
Enable
Status
Diagnose
Create Shortcut
Delete
Rename
Properties
WiFi
SiNa
Intel(R) Wir

لەسەر لان کارتی وایەرەکە دەکەین و Enable ی دەکەین بۆ ئەوەی لان کارتەکە بکەوێتە ئیش، ئەگەر ویستمان پێکەوەبستنەکە بە وایەرلس بو ئەوا لان کارتی وایەرلسەکە Enable دەکەین

# دانانی ئایپی بۆ هەردوو کۆمپیوتەرەکە

بۆ ئەوەی پێکەوەبەستنەکە روبدات لەنێوات دوو کۆمپیوتەرکەدا دەبێت ئایپی بۆ هەردوو کۆمپیوتەرەکە دابنێین بەڵام نابێت هەردوو کۆمپیوتەرەکە یەک جۆر ئایپیان بۆ دابنرێت، دەبێت ئایپیەکان جیاوازبن.

**بۆ دانانی ئایپی بۆ کۆمپیوتەر پێشتر باسمان کردووە**

# پێکەوەبەستنی چەند کۆمپیوتەرێک (لەدوو کۆمپیوتەر زیاتر)

دەتوانین لە دوو کۆمپیوتەر زیاتر پێکەوە ببەستین، لەبەشەکانی پێشوتردا باسی نەخشە و شێوازەکانی پێکەوەبەستنی کۆمپیوتەرەکانمان کردووە

پێکەوەبەستنەکە زۆرجار بە سویچ و هابە یان تەنها بە کێبڵە بێ ئەوەی سویچ و هاب بەکاربهێنیت، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکاندا دەبێت:

- **کۆمپیوتەرمان هەبێت**
- **لان کارت لەسەر هەموو کۆمپیوتەرەکان بێت**
- **ئایپی بۆ هەموو کۆمپیوترەکان دابنێین**
- **ناوی کۆمپیوتەرکان بنێین**
- **گروپی نێتۆرەکەکە دیاریبکەین، دەبێت هەمویان یەک ناوی گروپیان هەبێت**

پێشوتر باسی لان کارت و ئایپیمان کردووە ئێستا باسی ناونانی کۆمپیوتەرو ناوی گروپ دەکەین

# ناونانی کۆمپیوتەر و گروپ

هەر یەکێک لە کۆمپیوتەرەکان ناوێکی بۆ دادەنێین بۆ ئەوەی بتوانین بەئاسانی بیانناسینەوە، بۆ ئەم کارەش ئەم هەنگاوانە جێبەجێ دەکەین:




لەسەر دیسکتۆپەکە کلیکی راست لە My computerبکە و Properts هەڵبژێرە پاشان خشتەیەکت بۆ دەکرێتەوە




دوای ئەوەی خشتەکەمان بـۆ دەکرێتـەوە کلیـک لـە Advanced system setting دەکەین، خشتەیەکی تر دەکرێتەوە و کلیک لە بەشـی Computer nameدا کلیـک لـە ئـایکۆنی Change دەکـەین خشـتەیەکی ترمـان بـۆ دەکرێتـەوە، لـە بۆشـایی Computer Namae نـاوی کۆمپیوتەرەکـە دەنێـین بەهـەر ناوێـک خۆمـان حـەز بکەین، لە بۆشایی خوارتر نوسراوە Workgroup نـاوی گرووپەکـە دەنێـین دەبێـت هەموو کۆمپیوتەرەکان یەک ناوی گرووپیان هەبێت.

ئێستا کارەکانمان تەواو کردوو، ریستارتێکی کۆمپیوتـەرەکان بکـەو پاشـان دەبێـت کۆمپیوتەرەکان پەیوەست بن پێکەوە و زانیاری ئاڵوگۆربکەن لەنێوان یەکتردا .
بۆ زیاتر دڵنیـابون لـەوەی بیـزانین لەوەی کۆمپیوتەرەکـان پەیوەسـتبون بەیەکـەوە دەتوانیـــت لـــە Run دا بنوســـەcmd و خشـــتەی دۆس دەکرێتـــەوە پاشـــان بنوســـــــە Pin 168.192.0.2 واتە دوای وشەی pingئاپیی کۆمپیوتـەری بەرامبـەر بنوسە ئەگەر Replayبو ئەوە پەیوەستن پێکەوە

```
C:\WINDOWS\system32\cmd.exe
Microsoft Windows XP [Version 5.1.2600]
(C) Copyright 1985-2001 Microsoft Corp.

C:\Documents and Settings\Test4>ping 192.168.1.1

Pinging 192.168.1.1 with 32 bytes of data:

Reply from 192.168.1.1: bytes=32 time=2ms TTL=64
Reply from 192.168.1.1: bytes=32 time=2ms TTL=64
Reply from 192.168.1.1: bytes=32 time<1ms TTL=64
Reply from 192.168.1.1: bytes=32 time<1ms TTL=64
```

# ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری نێوان کۆمپیوتەرەکان

دروستکردنی نێتۆرک بۆ ئالوگۆڕکردنی زانیاری و داتایە دوای ئەوەی کۆمپیوتەرەکان پەیوەستبون پێکەوە بەسەرکەوتویی دەتوانیت داتا و زانیاری بۆ یەکتر بنێریت هیچ یەکێک لە کۆمپیوتەرەکان ناتوانن بەئاسانی بەناو داتاو زانیاری کۆمپیوتەرەکەی تۆیا بگەڕێن و چ داتاو زانیاریەکان ویست ببەن بۆ خۆیان، بەڵکو دەبێت خۆت ڕێگە بدەیت کام زانیاری و داتایە ببات و بێتە ناو کام فۆڵدەرو هاردی کۆمپیوتەرەکەی تۆوە.

بۆ ئەم کارەش دەبێت فۆلدەری تایبەت دەست نیشان بکەیت بۆ ئەوەی داتاو زانیاری تێبکەیت و کۆمپیوتەری بەرامبەر بتوانێت بێتە ناو ئەم فۆڵدەرەوە داتاو زانیاریەکان ببات و سودی لێوەربگرێت.

باسی Shareی فۆڵدەر یان بڵاوکردنەوە و ئامادەکردنی ئەو فۆلدەرە دەکەین کە خۆت ڕێگە دەدەیت بە کۆمپیوتەری بەرامبەر بێتە ناو ئەو فۆلدەرەوە

## Share Folder

واتە ئامادەکردنی فۆڵدەر بۆ ئەوەی کۆمپیوتەری بەرامبەر بتوانێت بێتە ناو ئەو فۆڵدەرەوە و داتاو زانیاریەکان ببات بۆ خۆی و بەکاریبهێنێت




**هەنگاوەکان :**

دیاریکردنی ئەو فۆڵدەری مەبەستە کارەکەی لەسەر ئەنجام بدەیت، کلیکی ڕاست لەسەر فۆڵدەرەکە بکە و Properties هەڵبژێرە، پاشان خشتەیەکت بۆ دەکرێتەوە

دواى دەركەوتنى خشتەكە لەبەشى Sharing كليك لەسەر ئايكۆنى Advanced Sharing بكە و خشتەيەكى ترت بۆ دەكرێتەوە و نيشانەى راست لەخانەى تەنيشت Share the Folder بكە




پاشان كليك لە ئايكۆنى Permissions بكە خشتەيەكى ترت بۆ دەكرێتەوە

لەم خشتەيەدا لەبەشى سەرەوە

وشەى Everyone ى تيابو بيسرەوەوە

كليك لە ئايكۆنى Add بكە بۆ

ئەوەى خشتەيەكى ترت بۆ بكرێتەوە و

كليك لەسەر ئايكۆنى Advanced بكە

پاشان خشتەيەكى ترت بۆ دەكرێتەوە






دوای کلیک کردن لەسەر ئایکۆنی Advanced ئەم خشتەیەت بۆ دەکرێتەوە




کلیک لە ئایکۆنی Find Now بکە و پاشان لەبەشی خوارەوە سەرنج بدە وشەی Everyone بدۆزەرەو و کلیکی لەسەر بکە، پاشان Okبکە

پاشان خشتەی دوای ئەویش بە Ok دابخەرە تا دەگەیتە سەر ئەم خشتەیە و لەم خشتەیەدا خۆت ئازادیت ئایا فۆڵدەرەکە کەسی بەرامبەر چۆن بەکاریبێنێت بۆنمونە ئایا تەنها سەیری بکات یان بتوانێت گۆرانکارِی تێدابکات یان بتوانێت هەمو گۆرانکاریەکان لەناو فۆڵدەرەکەدا بکات بەئارەزووی بەکارهێنەری کۆمپیوتەری بەرامبەر.




ئەو بەشەی خوارەوە تایبەتە بەو هەڵبژاردەی کە باسمانکرد تا چەنددەسەڵات دەدەیت بەکەسی بەرامبەر هەڵسوکەوت بە فۆڵدەرەکەوە بکات

- ئەم بەشە واتە بەتەواوی کۆنترۆلی فۆڵدەرەکە بکات
- ئەم بەشە واتە بتوانێت گۆرانکاری تێدا بکات
- ئەم بەشە تەنها دەتوانێت داتاو زانیاریەکانی ناوی بخوێنێتەوە و ناتوانێت دەستکاری بکات

## دوای تەواوبونی ئەو هەنگاوانە دەبێت فۆڵدەرەکە کارێکی تری لەسەر بکرێت

وکو پێشتر کلیکی لای راست لەسەر فۆڵدەرەکە دەکەین و Properties هەڵدەبژێرین و ئەم خشتەیە دەکرێتەوە و بەشی Security کلیک لە ئایکۆنی Edit دەکەین




پاشان خشتەی تر دەکرێتەوە وەکو هەنگاوەکانی پێشوتر وایە




بگەڕێرەوە بۆ لاپەرەی پێشوتر چونکە ئەم هەنگاوانەوە وەکو بەشی Sharing هەنگاوەکان لێکدەچن تۆش هەمان کرداور هەنگاو جێبەجێبکە

ئێستا فۆڵدەرەکە بەم کردارو هەنگاوانە وامانکردووە کۆمپیوتەری بەرامبەر بەئاسانی بچێتە ناو فۆلدەرەکە و داتاو زانیاریەکانی بەکاربێنێت

# چۆن ئەو فۆڵدەرە بکەین بە درایڤ؟

دوای ئەوەی فۆڵدەرەکەمان Share کردەوە بۆ کۆمپیوتەرکانی تر ئەگەر بمانەوێت ئەو فۆڵدەرە وەکو درایفەکانی C و D هەمو کات لەبەردەستماندا بێت بۆ ئەوەی بەئاسانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین و کارەکانمان خێراتر بڕوات ئەوا بەم هەنگاوانە کارەکە دەکەین:




کلکیی راست لەسەر My Computerدەکەین و Map network drive هەڵدەبژێرین پاشان خشتەیەکمان بۆ دەکرێتەوە




لەم خشتەیەدا لەبەشی Drive پیتێک هەڵدەبژێرین بۆ ناوی درایفەکە، لەبەشی Folder فۆڵدەرەکە دیاری دەکەین کە دەمانەوێت بیکەین بە درایف، بۆ ئەمەش کلیک لە Browser دەکەین و فۆڵدەرەکە هەڵدەبژین و Finishدەکەین




دەبینین فۆڵدەرەکەمان بووە بە درایف و خوار درایفەکانی Cو D یەوە دەردەکەوێت.

# بەشداریکردنی پرنتەر - Share Printer

دەتــوانین تەنهــا یەک پرنتەرمــان هەبێــت و Share ی بکەیــن بــۆ هەمــوو کۆمپیوتەرەکانی تر بۆ ئەوەی لای خۆیانەوە چییان هەبو پرنتی بکەن

بـۆ ئەمەش پـرنتەرەکە لەسـەر یەک کۆمپیوتەر Share دەکەیـن و ئەوانـی تـر وەریدەگرن دواتر زۆر بەئاسانی هەرکەس پرنتـی هەبـو تەنهـا بەیەک کلیـک لای خۆیەوە دەتوانێت پرنت بکات

یەکەم هەنگـاو دەبێـت پـرنتەرەکە تەعریفکرابێـت لەسـەر کۆمپیـوتەرەکە پاشـان دەچینە سەر Control Panel و دەچینە بەشی Devices and printer لەو بەشەدا ئایکۆنی پرنتەرە تەعریفکراوەکەی لێیە، کلکیی راستی لەسەر دەکەین و Printer Properties هەڵدەبژێرین خشتەیەکمان بۆ دەکاتەوە




لەم خشتەیەدا دەچینە بەشی Sharing دەکەین و نیشانەی راست لە Share The Printer دەدەین و Apply دەکەین

دواتر دەچینە بەشی Security و ئەگەر لەبەشی سەرەوە Every one مان هەبو دەیسرینەوە، پاشان کلیک لە Add دەکەین




خشتەیەکی ترمان بۆ دەکرێتەوە کلیک لە Advanced دەکەین و خشتەیەکی تر دەکرێتەوە




پاشان کلیک لە Find now دەکەین، لەبەشی خوارەوە وشەی Every One هەڵدەبژێرین، هەموو خشتەکان بە ok دادەخەینەوە



دوای داخستنەوەی خشتەکان بە OK دەگەینە ئەم خشتەیە لەم خشتەیەدا دەوەستین و هەندێ مەرج و ئیشی تیدایە دەبێت بیکەین




لەم بەشەدا کارە گرنگەکان دەکەین و ڕێگە بەبەکارهێنەر دەدەین چۆن پرنتەرەکە بەکاربێنێت نیشانەی ڕاست لە هەڵبژاردەکە دەدەین کە دەمانەوێت

هەڵبژاردەی یەکەم بەکارهێنەر دەتوانێت تەنها پرنت بکات

هەڵبژاردەی دووەم بەکارهێنەر دەتوانێت پرنتەرەکە بەڕێوە بات و کۆنترۆڵی پرنتەرەکە لای خۆی دەبێت

ئێستا کارەکەمان تەواو پنتەرەکەمان Share کرد لەسەر یەک کۆمپیوتەرو کۆمپیوتەرەکانی تر دەتوانن وەریبگرن بەم شێوەیە:




کلیکی ڕاست و Add printer هەڵدەبژێرین پاشان خشتەیەک دەکرێتەوە لەبەشی خوارەوە ...Add Network هەڵدەبژێرین چاوەڕێ دەکەین تا دەگەڕێت پرنتەرەکە دەدۆزێتەوە و هەلیدەبژێرین

ئێستا دەتوانیت زۆر بەئاسانی پرنت بکەیت بۆ ئەوەی پرنتەرەی Share کرابوو

# پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەر بە وایەرلس

پێشتر باسمان کرد چۆن دوو کۆمپیوتەر پێکەوە دەبەستیت بە وایەر، ئێستاش باسی پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەر دەکەین بە وایەرلس

-دەبێت لان کارتی وایەرلس لەسەر هەردوو کۆمپیوتەرەکە هەبێت بۆ دڵنیابون لەبونی لان کارت لەسەر کۆمپیوتەر (پێشتر باسمانکردووە چۆن سەیری دەکەین)،
-دەبێت لان کارتەکان ناسێنرابن لەسەر کۆمپیوتەرەکان
- ئایپی ئەدرەس بدەین بەهەردووو کۆمپیوتەرەکە ( پێشتر باسمان کردووە چۆن ئایپی دەدەین بە کۆمپیوتەر) بەڵام دەبێت لەسەر لان کارتی وایەرلسەکە ئیشەکان بکەین




چەند هەنگاوێک هەیە لە کۆمپیوتەری یەکەمدا دەیکەین، پاشان لە کۆمپیوتەری بەرامبەردا پەیوەست دەبین بە وایەرلسی کۆمپیوتەرەکەو و پاسۆرد داخڵ دەکەین:
بەم شێوەیە وایەرلسەکە دروست دەکەین:
Control Panel پاشان کلیک لە Network and Sharing Center دەکەین و ئەم بەشە دەکرێتەوە
لەم بەشەدا کلیک لە Set up a new connection network دەکەین خشتەیەکی ترمان بۆ دەکرێتەوە



دوای کردنەوە ئەم بەشە

کلیک دەکەین لە Set up wireless ad hoc (computer to computer) network




خشتەیەکی ترمان بۆ دەکرێتەوە Next دەکەین



پاشان خشتەیەکی ترمان بۆ دەکرێتەوە ناو و پاسۆرد داخڵ دەکەین

Set Up an Ad Hoc Network

Give your network a name and choose security options

| | |
|---|---|
| Network name: | Mohamad |
| Security type: | WPA2-Personal |
| Security key: | ••••••••• |

Help me choose

Hide characters

Save this network

Next Cancel

لە خانەی Name Network ناوێک دادەنێین دواتر لە کۆمپیوتەری بەرامبەر ئەم ناوە دەبێتە بە ناوی وایەرلسەکەو ئێمە پەیوەست دەبین بەم ناوەوە
لەخانەی خوارتر Security Key پاسۆرد بۆ وایەرلسەکە دادەنێین، کۆمپیوتەری بەرامبەر ئەم پاسۆردە نەزانێت ناتوانێت پەیوەست بێت بە کۆمپیوتەری تۆوە، Next دەکەیت کارەکەمان تەواو بو
ئەو کۆمپیوتەرەی دەیەوێت پەیوەست بێت بە کۆمپیوتەرەکەی تۆوە ئەو ناوەی سەرەوە تۆ نوسیوتە دەبێتە ناوی وایەرلسەکە و کۆمپیوتەری بەرامبەر دەیدۆزێتەوە و کلیکی لێدەکات تا پەیوەست بێت بە کۆمپیوتەرەکەی تۆوە، پاشان دەبێت پاسۆردەکەی تۆ بزانێت ئەو پاسۆردەی تۆ داتاوە داخڵی دەکات و پەیوەست دەبێت بە کۆمپیوتەرەکەی تۆوە و دەتوانن ئاڵوگۆری زانیاری و داتا لەنێواندا روبدات وەکو چۆن لە پەیوەندی دوو کۆمپیوتەر رویدا کاتێک بەوایەر پەیوەست بون پێکەوە.
وەکو پێشتر باسمان کرد دەتوانیت فۆلدەرێک لەنێوان دوو کۆمپیوتەرکەدا Share بکەیت بۆ ئاڵوگۆری زانیاری یان پرنتەر Shareبکەیت لەنێوانیاندا پێشتر ئەمانەمان هەموی باسکردووە

ئێستا دەچینە کۆمپیوتەری بەرامبەر بۆ ئەوەی پەیوەست بین بەو کۆمپیوتەرەی بەچەند هەنگاوێک وایەرلسەکەمان دروستکرد




بۆ دۆزینەوەی وایەرلسی کۆمپیوتەرەکە

کلیک لە وایەرلسی کۆمپیوتەرەکە دەکەین

لە لیستی وایەرلسەکان ناوی وایەرلسەکە دەدۆزینەوە دواتر داوای پاسۆردت لێ دەکات پاسۆردەکەی دەدەینێ و پەیوەست دەبین بە کۆمپیوتەرەکەوە و دەتوانین ئاڵوگۆری زانیاری و داتا بکەین











نێتۆرکی وایەرلس لەروی نرخەوە هەرزان دەکەوێتە سەر بەکارهێنەر, چونکە وایەر بەکارناهێنرێت, بەڵام لەروی پارێزراویەوە زۆر لاوازە چونکە هاکەرەکان دەتوانن زۆر باسانی هاکی بکەن, بۆ دورویەکی کەمیش بەکاردێت, ئێمە لێرەدا باسی پێکەوەبەستنی دوو کۆمپیوتەرمان کرد, وەک پێشتر باسمانکردووە دەتوانین نێتۆرکی وایەرلس دروست بکەین بەدانانی راوتەرێکی وایەرلس چەند کۆمپیوتەرێک پێکەوە ببەستین.

لە نێتۆرکی وایەرلسدا داتاکان بە هەوادا دەڕوات نابێت رێگری گەورەی لەبەردەمدا بێت لەبەر ئەوەی کاردەکاتە سەر خێرایی نێتۆرکەکە هەروەها کەش و هەوا کاریگەری هەیە بۆ سەر وایەرلسەکە, دەبێت ئاگاداری وایەرلس بین کە بۆ دوریەکی کەم بەکاردێت و لەڕوی پارێزراویەوە لاوازە.

